

وەزارەتی رۆشنبیری
حکومەتی هەرێمی کوردستان




لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری
زنجیرە کتێبی ئینستیوتی کەلەپوری کوردستان
( 1 )

# بەرکوتیێکی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی

PDF4Kurd

## لێکۆڵینەوە و رەخنە

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی

## سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر

هەولێر ـ 2005

**بڵاوکراوەی وەزارەتی رۆشنبیری**

**زنجیرە کتێبی ئینستیوتی کەلەپوری کوردستان**

( 1 )

**ناوی کتێب:بەرکوتێکی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی**

**نوسینی:سەدرەدین نورەدین**

**پێداچوونەوەی:د.شوکریە رەسول**

**د.عەزیز گەردی**

**نەخشەسازی بەرگ:ئاسۆ مام زادە**

**تایپ:نووسینگەی گۆڤار (زەردەشت مستەفا)**

**سەرپەرشتی چاپ:دەرباز مامند ئاغا**

**چاپ: چاپی یەکەم 2005/هەولێر**

**تیراژ:1000 دانە**

**چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری**

**ژمارەی سپاردن (184)ی ساڵی 2005ی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانی دراوەتێ**

**نرخ: 2000 دینار**

---

**ناونیشان : هەولێر ــ گەڕەکی روناکی ــ شەقامی روناکی ــ کۆڵانی ژمارە (342) ــ خانوی ژمارە (13)**

**تێلفاکس : 2519558**

# ناوەرۆك

## پێشەکی:

مەتەڵ وەك بەشێکی گرنگی ئەدەبی سەرزاری ڕۆڵێکی گرنگی لە زاخاودان و وریاکردنەوە و فەلسەفەی بیری سەرەتایی لە ڕامان و بیرکردنەوە لە شتە شاراوەکان بە مەبەستی تێگەیشتن و هەڵهێناندا بینیوە. سەرباری ئەوەی لە رووی هونەری ڕوونبێژی و جوانــــبێژی و واتا بێژیدا بەرزیی ڕەسەنایەتی زمان و کەلەپـــووری کـــوردی دەرخستووە و زمـــانی کـــوردی لە وشەگەلیدا دەوڵـــەمەند کـــردووە. لە رووی ناوەڕۆکیشەوە لایەنی ژیانی دێـــرینی نەتەوەکەمانی لە هەموو روێکی وەك: ئاین، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ڕۆشنبیری، ئابووری ڕەنگی داوەتەوە.

**کتێبی**(بەرکوتێکی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی) **بەرهەمی کاك**(سەدرەدین نورەدین)**ە کە ڕەنج و کۆششێکی زۆری چەندین ساڵەی داوە تا ئەم بەرهەمەی کۆکردۆتەوە و ساغ و پۆلین و شیکردۆتەوە و بە شێوەیەکی بابەتییانە سێ بەرهەمی سێ نووسەری کوردی لەم بوارەدا وەك:–(ئۆرخانی غالب، ڕۆستەم باجەلان، حەمەی مەلاکەریم)ی هەڵسەنگاندوە و ڕاو بۆ چوونی خۆی دەربڕیوە**

ناوبـــراو نـــرخ و بەهای فـــۆلکلۆری گەلەکەی بە چـــــاکی زانیووە و یەکێکە لە خەمخۆرانی ئەو مەیدانە کە بە چاوێکی قەدرزانینەوە دەڕوانێتە کەلەپـــووری کـــــورد و ئەدەبی هاوچەرخی کـــــوردی لە سەر بناغەی فـــــۆلکلۆرەکەی بەستۆتەوە، بەمە پتر ڕەسەنایەتی و کەسایەتیی کورد و پێشکەوتن و داهێنان و جوانکاریی سەردەمەکەی تیا بینیوەتەوە،بە پەرۆشەوە دەڕوانێتە پاشەڕۆژی فۆلکلۆری کوردی و بایەخ پێدانی لە لایەن دامودەزگا حکومییەکان و ناسینی فۆلکلۆری کوردی بە جیهان ...

ئەم کارەی کــــاك ســـەدرەدیـــــن خـــۆی لە خۆیدا بیرکردنەوە لە هەڵهێنان و هەڵسەنگاندنیان و رەوانی و جوانکاری دەقەکان ئاسان و روونتر دەخاتە روو... هەر بۆیە دەست خۆشی لەم کارە ئەکادیمییەی دەکەین و بە هیوای بەردەوامی لە کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی بەشەکانیتری فۆلکلۆری کوردی و بە چاپ گەیاندنی بۆ دەخوازین، هەر سەرکەوتووبێ...

پ. د .شوکریە رەسووڵ ئیبراهیم

**2004/8/8**

## فۆلكلۆر چییه و بابەتەكانی چین و بایەخیان چییه[1]؟

(سیر ولیام جۆن تۆماس)ی شوێنەوارناسی بەریتانیایی یەكەم جار زاراوەی (فۆلكلۆر)ی بۆبابەتەكانی كەلەپوور لە ساڵی1846ز بەكارهێناوە.

رەنج و كۆششی زانایانی ئەڵەمان:_ (یاگوب گریم 1775- 1863) و (ویلهیلم گریم – 1877) بە سەرەتای زانستی لێكۆڵینەوەی كەرەستەی فۆلكلۆر دادەندرێن[2]

فـــۆلكلۆر وشەیەكی لێكدراوە، ئینگلیز و ئەڵەمان و یۆنانی و... بەكـــاریدێنن. بەمانای كەلەپووری میللەت (كەلتووری گەل) دێت، عـــەرەبیش (التراث الشعبي) بۆ بەكار دێنن. وشەی فۆلكلۆر لە نووسینی كوردیدا، یەكەم جار لە لایەن خوالێخۆشبوو مارف بەرزنجی لە ساڵی 1958ز.دا لە ژمارە دووی گۆڤاری شەفەق لە ژێر ناونیشانی ((كورد و فۆلكلۆر)) بڵاوكراوەتەوە، دواتریش بەهەشتی و مامۆستایان محمد تۆفیق وردی و عوسمان شارباژێڕی و تایەر تۆفیق... بەكاریان هێناوە[3].

بەشێكی كەلتووری میللەت كە زارەكی(زارگۆتە)ن **فۆلكلۆرە**، كە: پـــەندی پێشینان، قسـەی نەستەق، مـــەتەڵ،گاڵتەوگەپ، هۆنراوە،ئاواز و گۆرانی و شین و لاواندنەوە، چیرۆك،داستان و ئەفسانە و... دەگرێتەوە.

بەشێكی دیكەشی كە پێی دەڵێن: **ئەتنۆگرافیا**، شتی مادی و نازارەكین (هونەرەكانی میللی) وەك: شایی و هەڵپەڕكێ و نەخش و نیگار و درامای میللی و داب ونەریتی وەك: ئافرەت رازاندنەوە و ژن خواستن و بـــووك گواستنەوە و مـردوو ناشتن و لێنانی چێشتی

---

1 – لە دیمانەیەكی تەلەفزیۆنی هەرێم لە ساڵی 2000 بڵاوكرایەوە و پرسیارەكانیش لە لایەن كاك فەرەیدون سامانەوە ئاراستەدەكران و كۆپیەكیشی لە لای بەرێزیان مایەوە بەو نیازەی لە گۆڤارێكدا بڵاوی بكاتەوە،ئاگاداری بڵاوكردنەوەی نیم .

2– شوكریە رەسووڵ(1997) رێگاكانی كاری مەیدانی فۆلكلۆری كوردی، ل3،هەولێر. هەروەها بڕوانە د.هیوا عومەر ئەحمەد(1979)مێژووی فۆلكلۆر، نووسەری كورد، ژ 4،ل 66.

3- د. شوكریە رەسولّ ئیبراهیم ( 1983) گۆڤاری كاروان، ژ 14 ل 22-25.

میللی و پیشه دەستییەکانی وەك:چیغ و کوین[4] دروستکردن و تەون و جۆلایی و شالوشەپك و گۆرەوی و کلاش چنین و کالەك و جل و کالا دروویـن و دەستاڕهاڕیـن و جۆخین کوتان و رەوسە بڕکردن و ساوار کوتانەوە و... دەگرێتەوە [*]).

فۆلکلۆر هەم کەرەستەیە و هەم زانستیشە. ناوەرۆك و روخساری فۆلکلۆریش هەمیشە بە پێی گۆڕانی قۆناغی کۆمەڵگە و بارودۆخی ژیانی گەلان گۆڕانکاری بەسەرداديت, بەلام لە هەمان کاتیشدا شەقڵ و سیمای نەتەوەکە دەنوێنێت.

## ئەدەبی فۆلکلۆریی چییە؟ :-

ئەدەبی فـــۆلکلۆر: پـــەندی پێشینان، قسـەی نەستەق، مـــەتەڵ، گاڵتەوگەپ، هۆنراوە،چیرۆك،داستان و ئەفسانە و...دەگرێتەوە، ئەدەبێکە دەماودەم و پشتاوپشت و ناوچە بە ناوچە هاتووە و لە رووبەری پان وبەریندا بلاوبۆتەوە، ناوی دانەرەکانی بزر بووە و بووە بە مولکی گشـــتی (مولکی نەتەوەکە)، باری ژیـــــــانی گەلەکە بە شێوازێکی سادە دەنوێنێت و قۆناغەکانی مێژوویی و گۆڕانکارییەکانی دەردەخات. (گۆرانی بە کۆنترین بابەتی هونەری و ئەدەبی مرۆڤایەتی دادەندرێت)

ئەم ئەدەبە زارەکییانە جـــــۆراوجۆرن، وەك چێشتی مجێور، تێکەلاوێکی هەمە بابەت و هەمە رۆژگار و هەمەشوێنە، پڕ لە شتی بە پێز و جوان و نەمرە، لەهەمان کاتیشدا کەموکورتی و پڕوپوچ و خشتوخاڵیشی تێدایە.

## بایەخی فۆلکلۆری نەتەوەیەکی بن دەست و بێ دەوڵەت چییە:

هەر سەردەمێك و هەر قۆناغێکی ژیان خاسیەت و تایبەتمەندیی خۆی هەیە، گۆڕان و پەرەسەندنی ژیار و شارستانییەتی مرۆڤایەتیش پێبەپێ بووە، وەك دەزانین ئەدەبی راستەقینە، ئاوێنەی بالانمای رۆژگار و سەردەمی خۆیەتی (بۆ ئێمەی کورد

---

4- رەشماڵ، رەشمار، تاوڵ.کوین.

*- د. عەزیز گەردی – هەڤپەیڤین

ئەدەبی فـــۆلکلۆرە، چونکە ئەدەبی نووسراوی دێرین ومێژووییمان دەگمەنە یا هەر تۆمار نەکراوە) کەواتە فۆلکلۆر ئاوێنەی بالاَنمای رابردوومانە بە رووناکی و بە تاریکییەوە، ئەوەی ئەم ئاوێنەیە بشکێنێت ئەوا ناتوانێت بالاَی خۆی بە درێژایی رۆژگار ببێنێت، ((یەکێك لە مەرجە بنەڕەتییەکانی بوون و مانەوەی هەرنەتەوەیەك خۆناسینە، واتە دۆزینەوەی شوێنەوار و مێژووی باو و باپیران، کە پیی دەگوترێ کەلەپووری نەتەوایەتی[5])) ئەدەبی فۆلکلۆریمان زادەی هزری باوك و باپیرانمانە، سیما و بۆنی ئەوان دەدا، کە باوك بڕوا میرات و جینەکانی بۆ منداڵەکانی دەمێنێتەوە، هەر نەوەیەکیش زمان و کەلتوور بۆنەوەکانی دوای خۆی بەجێدێلێ، ئەوەی بایەخ بە نەتەوە و رابردووی خۆی نەدا، هەرگیز ناکرێت بێکەموکورتی، بایەخ بە ئێستای خودی خۆی و جیهان و داهاتووی بدات، پتر بە دارێکی رەگبڕاو دەچێت.

ئەلیکسەندەر کـــراب دەڵێ: ((فـــــۆلکلۆر زانستێکی مێژووییە، بۆیە دەبێ ئەم زانستە بپارێزرێت و ببێ بە بەردی بناغەی ئەدەبی پێشکەوتوو[6]))

## تائێستا چ هەوڵێك بۆ کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی دراوە

لیستی ئەم هەولێ وبەڵگەنامانەی خوارەوە، درەنگ وەئاگاهاتنەوەی خۆمان و سامانێکی زۆر و مێژوویەکی هەژار و لاوازمان بۆ دەردەخات،

*- یەکـــەم کـــۆکراوەی فۆلکلـــۆری کـــوردی لە رووسیا لەبەردەست دا بـــووبێ دەسنووسێکە (ژمارە 373، ل 119) لە ســــــاڵی 1711 ز.دا نـــووسراوەتەوە و لە ئەرشێفی (ماتێناداران) لە ئەرمەنستان پارێزراوە، نزیکەی 15 قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی تێدایە و بەئەلف وبێی ئەرمەنی و بە زمانی کوردی نووسراوەتەوە[7]

---

5- حەسەن جاف (1985) چیرۆکی نوێی کوردی، ل 55 ،بەغدا، چاپخانەی عەلا.

6- د. عومەر ئیبراهیم عەزیز(1992) گۆڤاری لاوك، ژ 1، ساڵی 1 ، ل 98 .

7- قەناتی کوردۆ (1976) ، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی ، ل 6 .

*- (فردريك فۆن شتێت) له ساڵی 1849دا باسێکی زانستی لەسەر گۆرانی و ئاوازی کوردی له ئەوروپا بڵاوکردۆتەوە[8].

*-(پیتەر لێرخ) زانا و رۆژهەڵاتناسی رووس، یەکەم کەسبووە فۆلکلۆری کوردی له زاری کوردەکانی ئەرمینیا کۆ کردۆتەوە و له کتێبە بەناوبانەگەکەیدا: ((لێکۆڵینەوە – له بارەی کوردەکانی ئێران و خالدییەکانی باو و باپیرانیان))ەوە گەلێك تێکستی فۆلکلۆری کوردی بڵاوکردۆتەوە، لێرخ بابەتی فۆلکلۆری له کوردەکانی (ماردین، جەزیرە، دەرسیم، موش، دیاربەکر، ئورفە، خاربوت، ئەرزەرۆم) وەرگرتووە، بەرگی دووەمی کتێبەکەی له 1857ز له پیترسبوورگ چاپکردووە[9].

*- ( ئەلیکساندەر .ژابا) که کونسۆڵی ئیمپراتۆرییەتی رووس بووە له تورکیا له ساڵی1836–1869ز.دا به یارمەتی (مەلامەحمودی بایەزیدی) کەرستەیەکی زۆری له بارەی ئەدەب و فۆلکلۆر و زمان و ئەتنۆگرافیای کوردەوە کۆکردۆتەوە و له ساڵی 1860 ز.دا کتێبێکی له پیترس بۆرگ، به ناوی ((جامع یی رسالیان و حکایتان بزمانی کورمانجی)) به کوردی و فەرەنسی چاپکردووە[10]. (د.فەرهاد پیربال)یش له لای خۆمان به کوردی بڵاوی‌کردۆتەوە.

*- (خ. ئابۆڤیان) رۆژهەڵاتناس و رۆشنبیرو پێشکەوتووخوازێکی ئەرمەنییە، گەلێك خزمەتی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی کردووە و بابەتیشی له گۆڤاری (قەفقاس) له تبلیس له ساڵی1848، ژ 471، ل 188 به ناونیشانی (کوردان) بڵاوکردۆتەوە[11]. به عەرەبی و به کوردیش له عێراق چاپکراوەتەوە.

---

8- شوکریە رەسووڵ( 1997) رێگاکانی کاری مەیدانی فۆلکلۆری کوردی ، ل 30.

9- د. شوکریە رەسوڵ ئیبراهیم ( 1983) گۆڤاری کاروان، ژ14، ل 21 . هەروەها ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب 2 ، ل 51.

10- قەناتی کوردۆ (کوردۆییف) (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی ل 7–8 .

11- عیزەدین موستەفا رەسوڵ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ل 10.

*- ( ئەلبەرت سۆتسین) زانـایەکی سـویسراییە لە ساڵانی 1887-1890 بە هـاوکاری (ئیگین پرایم) دوو کتێبیان لە بـارەی زمان و فـۆلکلۆری کوردییەوە بڵاوکردۆتەوە، لە کتێبی دووەمیاندا گەلێك چیرۆك و داستانی کوردییان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئەڵمانی[12].

*- (س. ئا. یەگیزارۆف) لە کتێبی((مێژوویەکی ئەتنۆگرافیی کوردی پارێزگای یەریڤان))دا هەندێ تێکستی فۆلکلۆری کوردی لە تفلیس لە ساڵی 1891. بڵاوکردۆتەوە، کە دەیان پەند و قسەی نەستەقی کوردیی تێدایە[13].

*- (ئۆسکارمان) لە ساڵی 1905-1909 ز..دا کتێبێکی نایابی بە دوو بەرگ بە ناوی ((تحفة مظفرية)) لە بەرلین چاپکردووە .گەلێك داستان و چیرۆکی وەك:
((مەم و زین، زەمبیلفرۆش، ناسر و ماڵماڵ، بەیتی ئاوڕەحمان پاشای بەبە...هتد)) گرتۆتەخۆی، زۆربەیانی لە ناوچەی موکریان کۆکردۆتەوە[14]. مامۆستای نەمر (هێمن موکریانی) هێناویەتیە سەر رێنووسی کوردی و ساخیکردۆتەوە و پێشەکییەکی پوختیشی بۆ نووسیوە، کتێبێکی کەم هاوتایە و کۆڕی زانیاری کوردی لە 1975ز لە بەغدا چاپی کردووە.

*- ( ئەلبەرت فۆن لکۆك) لە ساڵی 1901ز. چۆتە کوردستانی باکوور و ژمارەیەك پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و چیرۆکی کوردی و نەوبەهاری ئەحمەدیخانی و مەولودنامەی پێغەمبەر ...ی کۆکردنەوە و بە یارمەتی چەند کوردێك لە دیمەشق

---

12- قەناتی کوردۆ (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل 14.

13- قەناتی کوردۆ(1976) ، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی ، ل 8 .

14- قەناتی کوردۆ (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل 15 . ساڵی 1906 نووسراوە. بەڵام لای د. شکریە رەسولْ ساڵی1905 نووسراوە.

**شیکردۆتەوە، بە پیتی عەرەبی و لاتینی و وەرگێڕدراوەکەشی بۆ ئەڵمانی لە ئەڵمانیا چاپکردووە**[15].

*– (**سەرکیس ئایکۆنی**، 1838 –1908 ) **لە کتێبەکەیدا کە تایبەتە بە فــۆلکلۆری کورد و ئەرمەن، سەدان پەند و قسەیئەستەق و بەرهەمی ئەفسانەیی فۆلکلۆری کوردی گرتۆتە خۆ**[16].

*- (**ئی. نۆئیل**) **ئەفسەرێکی ئینگلیزە، ماوەیەکی دوور و درێژ لە کوردستاندا ژیاوە، لە** 1920 **ز. وتارێکی بە ناوی** ((**خاسیەتی کورد لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق**)) **بڵاوکردەوە، نموونەی پەندەکانیشی لە دەڤەری هەکاری کۆکردبوونەوە**[17].

*– (**هۆگو مکس**) **زانایەکی ئەڵەمانییە، چەندین چیرۆك و داستان و پەندی پێشینانی لە ناوچەی ماردین**(**بەشێوازی کرمانجی سەروو**) **کۆکردۆتەوە و لە** 1926**لە لینینگراد لە چاپدراوە**[18].

*– (**ئۆریان تالیست**)**ی کوردناس، کتێبێکی بە زمانی فەڕەنسی دەربارەی کورد و فۆلکلۆری کوردی لە ساڵی** 1932 **بڵاوکردۆتەوە**[19].

*– (**پۆل – مارگرێت**) **و ( کامەران بەدرخان**) **لە ساڵی** 1937 **دا لە پاریس بەناوی** ((**پەندی پێشینانی کوردی**)) **کتێبێکیان بڵاوکردۆتەوە**[20].

---

15– **د. شوکریە رەسولٚ ئیبراهیم،**( 1984) **ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب** 2 ، **ل** 10.

16– **شوکریە رەسوولٚ** ( 1997) **رێگاکانی کاری مەیدانی فۆلکلۆری کوردی، ل** 35.

17– **قەناتی کوردۆ**(**کوردۆییف**)(1976) **کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل** 14–15.

18– **د. شوکریە رەسولٚ ئیبراهیم،**( 1984) **ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب** 2 ، **ل** 10.

**19– د. عومەر ئیبراهیم عەزیز(1992) گۆڤاری لاوك، ژ 1، ساڵی 1، بیبلۆگرافیای فۆلکلۆری کوردی، ل 98 .**

20– **قەناتی کوردۆ** (1976) **کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل**15.

*–(**رۆژی ليسكۆ**) **زانـــايەكی فەرەنسييە لە 1937دا ؟؟؟ كتێبی** ((**پەندی پێشينان ومەتەڵی كوردی**)) **دوای شيكردنەوە و وەرگێڕانی بۆزمانی فەرەنسی، لە پاريس چاپكردووە**[21].

كوردةكانی خـــــــــــــؤشمان لة سييةكانی سةدةی بيستةمدا

ضـــــــــــاويان لة بيانييةكان كـــــــــــــردووة، لة جياتی ذيَر و سةر و

بؤر و نـــــــــــــةحو و بــــــــــةلاغة و تةلَقيندانی زيندوو و مردووان بة

زمـــــــــــــانی عةرةبی و لةبری ئةزبةركردنی ثةندی

فـــــــــــــــــارسی و هةلَبةستی توركی، سةيريَكی خاكی ذيَرثيَی

خــــــــؤيان كردووة و لة ضرقةی نيوةرِؤدا سيَبةری خؤيان ديوة و

وةئـــــــــــطاهاتوونةتةوة و طريانيان بؤخؤيان و بؤ ميللةتةكةيان هاتووة، يا

باشترة بلَيَن ثتر دةرفةتيان بؤ رةخساوة و بارودؤخيان قؤستوَتةوة، نموونة: –

21– **د. شوكريە رەسولْ ئيبراهيم**،( 1984) **ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، ب** 2 ، **ل** 16.

*– مامۆستا (ئیسماعیل حەقی شاوەیس) لە ســاڵی 1933 ز. دا کتێبی ((قسەی پێشینیان گۆستاولۆبوون)) کە 612 پــەندی پێشینانی گرتۆتە خۆ، لە بەغدا بڵاو کردەوە[22]. و ((هەندێ پروپووچی پێشینان و مەتەڵ)) لە 1938دا لە دیاری بۆ لاوان،ژ بڵاوکردەوە.

*– (ئەمینی عەبداڵ و حاجی جندی[16]) لە ساڵی 1936 ز.دا کتێبێکی فــۆلکلۆری کوردی کە گۆرانی وداستان و ئەفسانە و... (مــەم و زیــن، شێخی سەنعان، لەیلا و مەجنون, زەمبیلفرۆش...)ی تێدایە بە نــاوی ((فــۆلکلۆری کورمانجا)) لە 663 لاپەڕەدا بڵاوکردەوە[23]. هەر ئەمینی ئــــەڤداڵ لە ساڵی 1952 کتێبی ((ئەتنۆگرافیا و فۆلکلۆری کوردی)) لە یەریڤان چاپکردووە.

*– (حاجی جندی بە هاوکاریی کارۆ زاکاریان) لە 1936ز.دا هەندێك تێکستی فۆلکلۆری: (گۆرانی دڵداری و هەڵپەڕکێ و قارەمانیەتی و...) بە نــاوی ((گۆرانی میللی کوردی)) لە یەریڤان چاپکرد[24] هەر حــــاجی جندی لە ساڵی 1957 دا کتێبی ((فۆلکلۆرا کورمانجا)) کە 393 لاپەڕەیە لە یەریڤان چاپکردووە، لە ساڵانی 61 و 62 و 1969.ز.دا سێ بەرگی ((حیکایەتی فۆلکلۆری کوردی)) لە یەریڤان لە چاپداوە.

*– مامۆستا (معروف جیاوك) لە ساڵی1938ز.دا کتێبی ((هەزار بێژە و پەند))ی لە بەغدا بڵاوکردەوە[25].

*– (پیرەمێردی نەمر) لە ســـاڵی1932 وەوە پــەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کۆکردۆتەوە و پەیتا پەیتا لە رۆژنامەکانی ژیان و ژین دا تا ساڵی 1950 بە شێوەی

---

22– د. شوکریە رەسوڵ ئیبراهیم،( 1984) ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب 2 ، ل 11.

23– د. شوکریە رەسوڵ ئیبراهیم،( 1984) ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب 2 ، ل 15.

24– قەناتی کوردۆ (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل8–9.

25– قەناتی کوردۆ (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل8–9.

هۆنراوه بڵاویکردوونەتەوه و دوای خـــۆشی کـــــــاکەی فەلاح بەناوی ((پەندەکانی پیرەمێرد)) له چوار بەرگدا چاپیکردوون ، دوا بەرگیان له 1980دا بڵاوکرایەوه، کە سەرجەم (4448) پەند و قسەی نەستەقیان گرتۆتە خۆ.

*– ( کوردۆییف، قەناتی کوردۆ) له ساڵی 1935–1950 له زاری کوردی سۆڤیەت ژمارەیەك تێکستی بـــــڵاو کردۆتەوه، له 1961 ز. دا لەگەڵ (م. رۆدینکۆ) نـــزیکەی 350 پـــەندی کــــــوردییان له کتێبی ((پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی گەلانی رۆژهەڵات)) له مۆسکۆ بڵاو کردۆتەوه، کتێبی ((چیرۆك وگۆرانی و داستانی کوردی)) له مۆسکۆ له ساڵی 1962دا چاپکردووه[26].

*– ((محمد موکری)) کتێبی ((گۆرانی یا ترانەهای کوردی)) له ساڵی 1951 له تەهران بڵاوکردۆتەوه[27].

*– ((عبالله ئەیوبیان)) کتێبی ((چریکەی خەج و سیامەند))ی له ساڵی 1956 له تەوریز چاپکردووه[28].

*– مامۆستای مەزن (شێخ محەمەدی خـــاڵ ) له ساڵی 1957ز.دا کتێبی ((پەندی پێشینان–بەرگی یەکەم))، بەرگـــــــی دووەمیشی له 1971دا چــــاپکردووه، کە بە هەردووکیان نزیکەی پێنج هەزار و سەد پەند و قسەی نەستەقیان تێدایە[29].

---

26– قەناتی کوردۆ (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل13.

27– شوکریە رەسووڵ ( 1997) رێگاکانی کاری مەیدانی فۆلکلۆری کوردی، ل 68.

28– شوکریە رەسووڵ ( 1997) رێگاکانی کاری مەیدانی فۆلکلۆری کوردی، ل 7.

29– د. شوکریە رەسوڵ ئیبراهیم،( 1984) ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب 2 ، ل 31.

*–رۆشنبیر و شـاعیری نەمر (جگەر خــــوێن) کۆمەڵێك پەندی پێشینانی بە شێوەزاری کرمانجی ژوورو بەناوی ((گۆتنا پێشینا)) بەپیتی لاتینی لە شام– سوریا، لە ساڵی 1957ز.دا چاپکردووە[30].

*– (جەمیل کەننە) ئەفسەرێکی خانەنشین بووە، ((تعریب حکم و امثال کردیة))ی لە ساڵی 1958 لە حەلەب – سوریا، بە شێوزاری کـــرمانجی سەروو و وەرگێڕدراوی عەرەبی چاپکردووە[31].

*– مامۆستا (محمد تۆفیق وردی) کتێبی ((حەسەن و مریەم))ی لەساڵی1955 دا لە بەغدا و ((فۆلکلۆری کوردی))– بەرگی یەکەم و دووەمی لە 1961، و بـــەرگی سێیەمیشی لە 1971دا، و لە ساڵی 1975 (نماذج التراث الشعبي الكردي) لە نەجەف چاپکردووە[32].

*– رۆژنامەکـــانی ریا تازە و کوردستان، ژین و ژیان و.... و گۆڤاری گەلاوێژ، شەفەق، کوردستان،....هتد گەلێك بابەتی فۆلکلۆرییان بڵاوکردۆتەوە.

*– (ئۆرخانی جەلیل) لە ساڵی 1964ز.دا کتێبی ((چوارینەی فۆلکلۆری کوردی گۆرانیی دلْداری و ئەڤین)) لە یەریڤان، و لە ساڵی 1966 – 1970ز.دا دوو کتێبی ((پـــەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی))[33] و لە ساڵی 1967 کتێبی ((داستانی قارەمانێتی کورد–خانی لەپ زێڕین))ی چاپکردووە. خــــانی لەپ زێڕین نامەی دکتۆراکەی بووە. (ئۆردخانی جەلیل و جەلیلی جەلیل) لە ساڵی 1972 کتـــێبێکی (455) لاپەڕەیان بەناوی ((مەسەلە و مەتەلۆکی کوردا ڤیْ زمانی

---

30– د. شوکریە رەسولْ ئیبراهیم،( 1984) ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب 2 ، ل 31.

31– قەناتی کوردۆ(کوردۆییف) (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل13.

32– قەناتی کوردۆ (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل11–12، و شوکریە رەسولْ ئیبراهیم،( 1984) ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب 2 ، ل 33.

33– قەناتی کوردۆ (1976) کۆمەڵە تێکستێکی فۆلکلۆری کوردی، ل10–11.

کوردی‌و روسی)) له مۆسکۆچاپکرد، که په‌ند و قسه‌ی نه‌سته‌قی کوردی به هه‌ردوو شێوه‌زاری کرمانجی باکوور و باشووری تیدایه، هه‌ر هه‌ردووبرا له ساڵی 1978 له مۆسکۆ دوو به‌رگـــی ((زارگۆتنا کوردا)یان بلاوکرده‌وه.

*– (چه‌رکه‌زی به‌کۆ–به‌کاییڤ) له ساڵی 1965 دا کتێبی ((زمانی کورده‌کانی ئازربایجان))ی له مۆسکۆ چاپکرد[34].

*– (قادری فه‌تاحی قـازی له) ســاڵی 1967 کتێبی ((شێخ صنعان)) و له 1968دا کتێبی ((منظومه‌ی، بهرام و گلندام)) و له ســاڵی1970 ((منظومه‌ی شۆڕ– محمود و مزرینگان)) و ساڵی 1973 ((منظومه‌ی کوردی ، شێخ فرخ و خاتوون ئه‌ستی )) له ته‌وریز چاپکردووه[35].

*– (محه‌مه‌دی مه‌لا که‌ریم) له ســــــاڵی 1968ز.دا کتێبی (( کۆمه‌ڵێك لاوك و حه‌یران))ی له به‌غدا چاپکردووه[36].

*–(د.عیزه‌دین مسته‌فا ره‌سول) له ساڵی1970ز.دا لێکۆڵینه‌وه‌یه‌کی زانستییانه‌ی به ناوی ((لێکۆڵینه‌وه‌ی ئه‌ده‌بی فۆلکلۆری کوردی)) له به‌غدا چاپکردووه و له 1978 به عه‌ره‌بی و له 1979 دووباره پوختتر به کوردی بلاوی کردۆته‌وه.

*– ( جه‌مال نه‌به‌ز) له ساڵی 1970 کتێبی ((په‌ندی پێشینان و قسه‌ی نه‌سته‌ق له کوردستانه‌وه))ی له میونخ به زمانی ئه‌ڵمانی بلاوکردۆته‌وه[37].

*– مامۆستایان و نه‌مران:– (نـه‌جمه‌دین مه‌لا) و (علاءالدین ســـجادی) و (گیو مـوکریانی) و (ره‌مــزی قه‌زاز) و (مه‌عصوم ئه‌نوه‌ر مـائی) و (ره‌شید هـــه‌ورامی) و

---

34– شوکریه ره‌سوول ( 1997) رێگاکانی کاری مه‌یدانی فۆلکلۆری کوردی، ل 68.

35– شوکریه ره‌سوول ( 1997) رێگاکانی کاری مه‌یدانی فۆلکلۆری کوردی، 74.

36– شوکریه ره‌سوول ( 1997) رێگاکانی کاری مه‌یدانی فۆلکلۆری کوردی، ل 69.

37– شوکریه ره‌سوول ( 1997) رێگاکانی کاری مه‌یدانی فۆلکلۆری کوردی، ل 69.

(محمد كريم شريف) و (عمر شێخ الله دەشتەكی) و (محمود زامدار) و (خالد جوتیار) ( فاروق حەفید زادە) و ( داود محمد شڕۆڵ) و (تارق جامباز ) و (ئەسعەد عەدۆ) و (عومەر ئیبراهیم عەزیز) و (شیخ جعفر بەرزنجی) و (سەعدولا ئیسماعیل شێخانی)... هتد، بابەتی فۆلكلۆری جۆراو جۆریان بلاوكردۆتەوە.

وەك لە سەرەوە دیـــارە كەمترین كۆكردنەوەی بابەتی فـۆلكلۆری لە كوردستانی بـــاكوور بووە، ئەمەشیان جێگەی داخە چونكە زۆرترین ژمارەی كــــورد لەو بەشە كپكراوەدا دەژین و فـۆلكلۆرێكی دەوڵەمەند و بە پێزیان هەیە، چـــاوەڕێی قەڵەم و هزری خەمخۆر و دڵسۆزانە.

لە لیستی سەرچـــاوەكانی كتێبی((بەركوتێكی مەتەڵی فۆلكلۆری))دا ئـــاماژەم بەو سەرچاوانە كردووە كە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردییان تێدا بلاوكراوەتەوە، بە تایبەتیش ئەوانەی من دەستم كەوتوون و سوودم لێوەرگرتوون (بە پێویستی نازانم لستەكە لێرە دوبارە بكەمەوە) سەرەڕای ئەو سەرچاوانەی كە من دەستم نەكەوتوون، یا ئاگاداریان نیم.

ئێستاش لە چەرخی خێرایی و كــــۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و بـــلاوبوونەوەی خوێندەواری لە هەمـوو ئاواییەكی ولاتەكەماندا، هەوڵ و هەڵمەتی تاكە كەسیی دڵسۆز و بەگوڕ لە ئـــارادایە، هەرچەندە كـــارەكان وەكو پێویست زانستییانە نین، بەلام هەنگاوی یەكەممان كۆكردنەوە و لە فەوتان دەربازكردنە، خوازیاریشین دەزگای كارا و بەتوانا بۆ ئەم مەبەستە بكەونەكار، ((كەسیش لە پڕێك نابێتە كوڕێك...، رۆژ و لات هەموو ولات...))

**ئایا راستە كورد لە فۆلكلۆرا دەوڵەمەندە؟ هەست ناكەیت بەهۆی پاشكەوتنی خۆمانەوە، بە شان و باهوی رابردوومان هەڵدەدەین، ئەگەریش هەبووەیە هۆی زەنگینییەكەی چییە؟**

**من لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوو لە بەغدا دەمخوێند، کەمینەی قوتابییەکانی زانکۆی بەغدا و زۆرینەی یەکەمەکانیشی کوردبوون، ئەمە راستییەکە نکۆڵی لیٚناکرێت، بـــەڵام بۆ لەم قۆناغانەدا دواگـــرتەی کاروانین؟ هەموومان دەزانین دەوروبەر بە ئەنقەست دەرگای پێشکەوتنمان لیٚدەگریٚ و کەندڕ و چاڵمان لەپێش هەڵدەکەنـــن و بـــەرپێنەشمان دەدەنیٚ، بە خـــۆشمان گەلێك خـــەم لە رابـــردوو و ئایندەی خۆمان ناخۆین، ئەگینا گەلێکی دەبەنگ و بیٚ تـوانا نین. بۆ سەیری زمانی فارسی و بلوجی و ئازەری و تورکی و...ناکەیت تا بزانیت زمانی عەرەبی لە سۆنگەی ئاینەوە چ دکرێکی پیٚکردوون؟ بەڵام زمانی کوردی هەرچەندە بیٚکەس و بیٚ پشتیوانیش بـــووە، فـــۆلکلۆر و ســـرووشتە ســـەختەکەی تا رادەیەکـــی بـــاش پاراستوویانە. کوردیش هەستی نەکردووە کە لە فۆلکلۆردا دەوڵەمەندە و واشی نەگوتووە، بەڵام لە دیـــٚرزەمانەوە رووناکبیر و مرۆڤ دۆست و رۆژهەڵاتناسانی جیهان دەرکیان بەوە کردووە و دارایی و سامانی ئێمە لەم بوارەدا ئەوانی سەرسام کردووە، زانیویشیانە کە ئێمە نرخی ئەم کەلەپوور و بۆماوەیە نەتەوایەتییەمان نازانین، بۆیان تۆمارکردووینە و هانیان داوین بەڵکو خـــۆبناسین و هـــەبووەیی هـــەبوونی خۆمان بچەسپێنین: -**

**(خ. ئابوڤیان) رووناکبیری مـــەزنی ئـــەرمەنی و رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ لە رۆژنامەی ( قەفقاس) لە (تفلیس) ژمارە 47، لاپەڕ 188، لە ساڵی 1848ز. دەربارەی فـــۆلکلۆری کـــوردی دەڵیٚ : ((شیعری فـــۆلکلۆر هـــەنگاوی گەورەی هاوێشتووە و گەیشتووەتە رادەی پوختی و نایابی. لەهەر کـــوردێکدا هەست و بەهرەیی شاعیری بەدی دەکرێت و زۆر بە ساز و ئاواز، گۆرانی بەسەر دۆڵ و چیا و تاڤگە و رووبار و گوڵ و چەك و ئەسپ و قارەمانێتیی وجوانیاندا دەڵێن...[38]))**

**38- قەناتی کوردۆ-کوردۆییڤ (1976) کۆمەڵە تێکستی فۆلکۆری کوردی ، ل 4.**

( ن . یا. مارو) زانایەکی گەورە و رۆژهەڵاتناسێکی ناسراوە، لە ساڵی 1911 ز نووسیویەتی:- ((فـــۆلکلۆری کوردی تەنیا لە ناو خۆیدا بڵاو نییە، بەڵکو لە ناو گەلانی‌تری رۆژ هەڵاتیشدا وەك عـەرەب، فـارس، تـورك، ئـازربایجانی و ئـەرمەنی و ئـاسوری دا باوە...))[39]

(مینۆرسکی) لە ل 7ی (( گـــــــــۆرانی و حیکایەتی قارەمانیەتی کوردی)) مۆسکۆ- 1962 دا گوتوویەتی: ((لای ئاسورییەکانی چیا، گۆرانی کوردی وتن و چیرۆکی کـــوردی گێڕانەوە بۆتە عادەتێکی گشتی))[40]. (کتێبەکە بە کـــوردی و بە عەرەبی لە عێراق چاپکراوەتەوە.)

(ڤاسیلی نیکیتین) لە کتێبی کـوردان، لە ل 362، مـــۆسکۆ، 1964ز. دەڵێت:- ((ئەدەبی کوردی لە پلەی یەکەمدا، فۆلکلۆری کوردییە، لەو فۆلکلۆرەدا هەرتەنیا پاشماوە و میراتی نەوە و پشتەکانی پێشوو نابینرێ، بەڵکو ئەمڕۆش ئەم فۆلکلۆرە بەڵگەیە بۆ بە توانایی لە ژیاندا و بۆ رەنگینی هێزی بەرهەم هێنان...))[41] (کتێبەکە بە کوردی و بە عەرەبی لە عێراق چاپکراوەتەوە.)

ژیان بە شێوەیەکی گشتی دان و وەرگرتنی زۆری تێدایە، ئەدەبی فۆلکلۆریش لە نێوان میللەتاندا هەروایە، بەتایبەتی لە نیـــوان دراوســـێکاندا، بەڵام ئێمە کە لە دێرزەمانەوە خاوەنی کیان و قەوارەیەکی سیاسی خۆمان نین و دەسەڵاتێکی ئەوەندە بە تواناشمان نەبووە تا بەرهەمە جۆراوجۆرەکانمان تۆمار بکەین و بە بەڵگەی میـــژوییەوە بیـانپارێزین، هەڵبەتە هـاوسێکانیشمان لە زۆر لایەنەوە لە ئێمە

---

39- عیزەدین مستەفا رەسوڵ (1979) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ 2 ، ل 10

40- عیزەدین مستەفا رەسوڵ (1979)... ل 10.

41- عیزەدین مستەفا رەسوڵ (1979) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ 2 ،ل 11.

بالأدەست و بەتواناتر بووینە و ئەرکەکـــانی خۆیانیان بـــاشتر جێبەجیٚکردووە، زۆرشتیش لە ماڵی ئێمە دەرچووە و کراوەتە ماڵی ئەوان وخۆشمان بیٚئاگاین یا بەتەنگییەوەنین، ئەوەتە لەم سەردەمەدا و بەنـــوێژی نیوەڕۆ و بەبەر چـــاوی جیهانـــەوە، گۆرانیبێژێکی گوندنشینی کوردی وەك ئیبراهیم تاتڵی ساز، گۆرانی تورکی بە ئاواز و ناوەرۆکی کوردیەوە دوای ئەوەی کلاو و شەدە و جامانەکانیان دادەگرێت و شەپقەیەکیان دەکاتە سەر تۆمار دەکـات و بە دونیادا بـــــــلاوی دەکەنەوە، ســــەیرتر ئەوەیە کە سەروگوێلاك شکاوەکانی خۆمان لەوان دەخوازینەوە و ئێمەش مەمنوون!!

## بۆ کورد لە فۆلکلۆردا دەوڵەمەند:

1- سروشتی کوردستان دڵگیر و هەمەرەنگ و پڕ پیت و بڕشتە، مرۆ هاندەدات بیر بکاتەوە و دەیخاتە نێو جیهانی خەیاڵ گێڕان و مێشك دۆشین.

2- سروشت و ژینگەی جۆراوجۆر و بارودۆخی ژیانی و کاروکردەوەی جیاواز و جیاوازیی پیشەکان (لە نێو کـــورداندا: مـــەڕداری، پەلەوەر و هەنگ بەخێوکردن و کشتوکاڵی هەمەچەشن وکاروانچییەتی و بـــازرگانی و پیشە دەستییەکان و...) لە رووبەرێکی فراواندا، کەلتووری زۆر و هەمەچەشن دێننە کایەوە.

3- زستانی سارد و درێژ و بیٚکاری، شـەوگاری پایزی درێـژ و ... نەبوونی یا کەمی هۆیەکانی کات بەسەربردن، کۆبوونەوەی خەڵك لە دەوری ئاگردان و لە ژێر دەوار و دیوەخان و... هۆکاری باشبووینە بۆ گێڕانەوە و بەسەروەنانی ئەدەبی سەرزاری، زۆرترینیشیان لەکاتی تەنیایی و بیرکردنەوەی هێمندا هەڵبەستراون.

4- زمانی کـــوردی چـــەندین شێوەزاری هەیە کە ئەمیشیان زمان و فۆلکلۆرەکەی دەوڵەمەندتر کردووە.

5- درەنگ و کەم بڵاوبوونەوەی خوێندەواری لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا، نەبوونی ئەلف وبێیەکی تایبەت بە زمانی کوردی، هۆکاری راستەوخۆن کە بوونەتە هۆی ئـــەوەی بـــەرهەمەکان زارەوزار بـــڵاوببنەوە و پشتاوپشت بمێننەوە و بڕیـــن و بەسەروەنانیان لەگەڵدا بکرێت و ناوی خاوەکانیان ون بکەن و زۆریشیان ئاوگەلە* بن و بکەونە نێو گەلەی دراوسێیەکانمان ئەوانیش بیگرنەوە و دروشمی[2 *] خۆیان لە گوێی بدەن و بیکەنە ماڵی خۆیان، یا بەزمانی بیانییان بۆمان نووسراونەتەوە.

## فۆلکلۆر پەرستی و نوێخوازی لە ئەدەبدا چۆن بەیەکەوە دەگونجێن؟

ژیان بریتییە لە گـــۆڕان و گـــۆڕانکاری ونوێ بـــوونەوە، ئەدەب بە دەریاچەیەك دادەندرێت، بەردەوام چەندین رووبـــــار دەڕژێنە ناوییەوە، ئاویشی لەبەر دەڕوات، ئەگەر نوێکردنەوە و لەبەر رۆیشتن نەبێت ئەوا دەریاچەکە بۆگەن دەبێت و ژیانی تێدا نامێنێت، خۆشویستنی فۆلکلۆر مانای وانییە ببینە دژی نوێخوازی و داهێنان بنەبڕببێت، ئەو فۆلکلۆریستانەی دژی نوێخوازین، لە فۆلکلۆر نەگەیشتوون و ئەرك وتام و نرخی نوێکردنەوەش نازانن، ئێمە دوێنێمان بـــۆ ئەمڕۆ و ئێستاشمان بۆ بەیانی گەرەکە.

کە بەنـــاوی نوێخوازییشەوە فـــــۆلکلۆر بە شتی مـــردوو و بێکەلك و بێبایەخ دەزانین وبە گشتی وەلای دەنێین و نەفـــــــــرەتی بەدوادا داوێین و فۆلکلۆرویستەکان بە مردووپەرست وبێ تـــــــــــوانا دادەنێین، نە لە نـــــوێخوازی گەیشتووین و نە لە فۆلکلۆر!. ناوە ناوە لێرە و لەوێ، لەخۆباییبوو دەردەکەون و لە پێناوی خۆ دەرخستن و ناوبانگ دەرکردن یاخی دەبن، بەڵام یاخی بوونێك تەنها لەپێناوی یاخیبوون وهیچیدیکەش نا، چـــــــونکە ئەوانە لە هەستی خـــــۆیان و

* ئاژەڵێك لە گەلەی خۆی دابڕێت و بکەوێتە نێو رانێکی دیکەوە.

[2 *] مەڕدارەکان، هەریەکەو دروشمێکی تایبەت بە خۆی( بڕین یا داخ) لە گوێی مەڕەکانی خۆیان دەدا، بۆ ئەوەی بزانرێت ماڵی ئەوە و ئەگەر تێکەڵاوی ئاژەڵی خەڵکیتر بێت بیناسێتەوە.

کۆمەڵەکەیان وکەڵتوور و مێژوو و رابردوویان، بە درك و گوڵییەوە بێزارن، بۆیە هێڵی راست و چەپ بەسەر هەموو راست و چەوت و ڕەشو سپییەکاندا دێنن و دمبــگی نوێخوازی دەکــوتن و وڕێنان دەکەن، لە واقیعی خۆیان یاخی دەبن، بەڵام دەمەلاسکەی خەڵکی کۆمەڵگایەك دەکەنەوە کە داب ونەریت و هزر و بیرکردنەوە و قۆناغی ژیانیان و ژینگە و سروشتی ئابوورییان لەگەڵ ئێمە یەك ناگرێتەوە، بۆیە بەرهەمەکانیان بەناکامی لەدایك دەبێت و رووت وبیٚناوەرۆك و تەمەن کوورت دەبن.

ئەگەر لە شارۆچکەیەکی موسڵمانانا کانیاوێك کرابێتە خێرات، یا حاجیەکی دەوڵەمەندی نەخوێندەوار، مزگەوتێك دروست بکات، کاری دکتۆر و ئەندازیار و رۆشنبیرانی شارۆچکەکەش تەنها لۆمەکردن و بیٚنرخ کردنی کارەکەبێت، یا لەبری ئەوە هەوڵ بدەن کەنیسەیەك دابمەزرێنن، ئەنجامەکەی چــی دەبێت؟ بەڵام ئــــەگەر لەجێی گلەیی و بەگـژداچوونەوە، ئەوانیش نەخۆشخانەیك و قوتابخانەیەك و دوو پرد و پڕۆژەیەکی ئاوی خواردنەوە بەناوی خۆیان بکەن، ئەوکاتە مێژوو و دانیشتوانی ناوچەکەش بەگشتی منەتباریان دەبن، و دەسخۆشی و ئافەرینیشیان لیٚدەکەن.

ئەوەی گوتم بۆچوونی تایبەتیمە، هەرکەسەش سەربەستە چۆن بیردەکاتەوە و چی دەنووسێت.

ئەمڕۆ ئەڵقەی بەستنی نێوان دوێنیٚ و بەیانییە، کــــەواتە ئەدەبی هاوچەرخی رەسەن و نەمر دەبێت لەسەر زەمینەی فۆلکلۆر بێت و دەستیشی بگاتە نوێخوازی و نویٚکردنەوە، بۆ **نموونە**:

1- (گــــۆران)ی شاعیر، پێی خستە سەر قۆناغەکـانی ئــــەدەبی فــۆلکلۆر و ئەدەبی کلاسیکی و رۆمانسیەت، ئینجا هـــەنگاوی بــۆ نویٚکــردنەوە و داهێنانی ریاڵستی نا، سودی لە وشەی فۆلکلۆری و کێشی شیعرە فۆلکلۆرییەکان (پەنجەکان، بڕگەکــان) وەرگرت و کردنییە بــەرگ و خشــڵ و پێوەری هەڵبەستە ناســـك و ریالیستییەکانی.

2–(سەعدی شیرازی) ئەدەبی فۆلکلوری فارسی کردۆتە دەسکەلای بابەتە ئاینییە پڕ بایەخ و ئەدەبییە بەرزەکـانی لە (( گوڵسـتان)) و ((بوسـتان))دا کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دەنگی داوەتەوە و بوەتە وێردی سـەرزمانی زاناو داناکان و بە نموونە دەیلێنەوە.

((شانامەی فیردۆسی)) بە داستانە فۆلکلۆرییەکانییەوە بووەتە شانامە.

3– (ڕەسوڵ هەمزە تـۆف) لە هەردوو بـــەرگی ((داغستانی من ))دا، فۆلکلوری داغستانی کردۆتە خشـــڵ و ڕوخساری بووکە نووسینەکانی، لە میانییانەوە هاوڵاتیانیی و نیشتمانەکەی بە جیهان ناساندووە.

4– (مەکسیم گۆرگی) دەڵێ: (( بناغەی ئەدەب فۆلکلۆرە......))

5– (نەجیب مەحفوز)، فـۆلکلۆر و بـاری ژیانی خەڵکیگەڕەکە میللیەکانی شاری قاهیرەی کردۆتە هەوێن و ڕوخساری شـاکارەکانی، لە ئاکـامدا مەزنترین خەڵاتی جیهانی بۆ خۆی و بۆ وڵات و نەتەوەکەی دەستەبەرکرد.

6– (یەشار کەمـال)، ئەفسـانە و داب ونەریت و جلوبەرگ و جنێودان و گـۆرانی کوردەکانی ئەراراتی کردۆتە سەربەند و دوابەندی نووسینەکانی، ئەوەتە ڕۆمانەکانی وەکو شاکاری جیهانی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانە هەرە دەوڵەمەندەکانی سەرگۆی زەمین.

7– (گابریل گارسیا مارکیز)، ڕۆماننووسی هاوچەرخ، کە خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە و بەرهەمەکانی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانە جیهانی و ناوچەییەکان، بە حەکـایەت و داستانە فۆلکلۆرییەکانی باپیرەی و داپیرەی گۆشکراوە و لە پەنجەرەی شارەکەیەوە (ماکـوندۆ)–کۆڵۆمبیا، دەڕوانێتە ئەمەریـــکای لاتین و هەموو جیهان، هەموو شاکارەکانیشی بۆن و سیمای شارەکەی دەنوێنن،

هیچ کامێك لەو کەڵە نووسەرانە و هەرە بەناوبانگەکانی دیکەی جیهان فۆلکلۆر بە پڕوپوچ و کەلاکی تۆپیو نازانن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، شانازیی پێوە دەکەن و لەکاری نوێکردنەوەشدا بەرجەستەی دەکەن.

**به موتربەکردنی چڕۆی ئەدەبی هاوچەرخ لەسەر بنچینەی فۆلکلۆر، رەسەنایەتیو کەسایەتیی خۆمان و پێشکەوتن و داهێنان و جوانکاری سەردەم دەچنینەوە.**

**چی بۆ فۆلکلۆر بکرێت باشە؟**

*** کۆمەڵەی فۆلکلۆری ئینگلیزی بۆ کۆکردنەوە بڵاوکردنەوەی بابەتە فۆلکلۆرییەکان، لە ساڵی** 1877 **ز دامەزراوە،**

* قوتابیانی (زانكؤی ئؤبسالا)، لة كـــــــــــــــــــــــؤتایی

سةدةی نؤزدةهةمدا، طرنطییةكی زؤریان بةكـــــــــــــؤكردنةوی دیالیكتي

سویدیدا و ئةرشیطی ئـــــــــــؤبسالا بة كؤنترین ئةرشیطی ریَكوثیَكی

ئةوروثا دادةندریَت كة كةلةثوری میلییان تیَدا كؤكردؤتةوة[42].

* (ئةلیاس لؤنرؤت و هةظـــــــــــالآنی) لة ساَی 1907ز (كؤمةلَةی

فـــــــؤلكلؤر ثةروران)یان دامةزراند كة ئامانجیان

كــــــــــــــــؤكردنةوة و لیَكؤلَینةوة لة

فـــــــــــــــــــــؤلكلؤری (فینلةندی) و بةراوردكردنی لةطةلَ

فۆلكلۆرى ئەوروپادا...بوو، ئەرشيفى فـــــــــۆلكلۆرى فينلەندە لە ئەرشيفە

طەورەكانى فۆلكلۆريى جيهانە، كە نزيكەى دوو مـــــــــــــــليۆن ونـــــــــيو

بابەتى فۆلكلۆرى لەسەر كاسيَت و كارت و ... تۆماركراوە[43].

* لە سالَى 1930ز ميرى ئيَرلەندئةيمانطەى فۆلكلۆرى ئيَرلەندى دامەزراند و طةليَك ليَذنەى تايبەت

بە فـــــــــــــۆلكۆرى ئيَرلەندى بۆدامەزراندنى ئەرشيفى طةلەكةيان كةوتنەكار[44].

*** نەتەوە زلهێز و هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان، لە بەناوبانگترین زانکۆکانیاندا، لێکۆڵینەوە لەسەر فۆلکلۆری خۆیان و گەلانی دیکەی دوور و نزیک دەکەن.**

*** لە مۆزەخانەی میللی کەلتوورە دێرینەکانیان دەپارێزن و پیشانی خۆیان و جیهانی دەدەن.**

*** بۆنە و رۆژی تایبەتییان بۆ زیندووکـــــردنەوە و یـــادکردنەوەی داب و نەریتە دێرینەکانیان هەیە و شانازیی پێوە دەکەن.**

*** تیپ و شانۆی تایبەتییان بۆ هەڵپەرکێ و نواندن و گۆرانییە میللییەکانیان هەیە.**

**کاتی ئەوە هاتووە کە ئێمەی کـــوردیش رابین و مشوورێکی رابـــردووی تـــۆمار نەکراومان بخۆین:**

---

42- **عیزەدین مستەفا رەسول** (1979) **لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ** 2 ، **ل** 10

43- **شوکریە رەسوول**( 1997) **رێگاکانی کاری مەیدانی فۆلکلۆری کوردی** ، **ل** 8.

44- **شوکریە رەسوول**( 1997) **رێگاکانی کاری مەیدانی فۆلکلۆری کوردی** ، **ل** 11.

1- له زانكۆكاندا لەبەشی زمـانی كـوردی و كۆلێجه پەیوەندیدارەكانی دیكەش بـایەخێكی تایبەتی به فـۆلكلۆر بدرێت، بەتایبەتی لەسەر ئاستی خوێندنی باڵاو تۆماركردن و نواندن و پێشكەشكردن و بڵاوكردنەوەدا.

2- له وەزارەتـی رۆشنبیریدا بنكەیەكـی تـــایبەت، وەك دەزگـایەك یـا بەڕێوەبەرایەتییەكی كارا بۆ فۆلكلۆر بكرێتەوە و ئاسانكارییان بۆ بكرێت (ئێستا هەیه بەڵام سڕ و بێدەسەڵاتە)، بـۆ ئەوەی بكەونە كـۆكردنەوە و تۆژینەوەی بـــابەته فۆلكلۆرییەكان، بۆ نموونە : كۆمەڵێك پـــەند و قسەی نەستەق و مەتەڵ له دەڤەره جیاجیاكاندا كۆبكەنەوە چەند كەسی شارەزاش شیتەڵ و شییان بكەنەوە، گرووپێكی دیكه چیرۆك وئەفسانە و داستانەكان تۆماربكا،كه پڕیانه له شتی دانسقەو نـایاب و فەنتازیاو خەیاڵی زانستی و...، دەستەیەكی دیكەش هۆنراوە و ئاواز و هەڵپەڕكێیه جۆراوجۆرەكان دەربازبكەن و بڵاویان بكەنەوە، خەڵكی لێهاتوو بەرنامەی رێكوپێك له رادیـۆ و تـەلەفزیۆن و سـەتەلایت و ئـەنتەرنێت دا بڵاوبكەنەوە و رۆڵەكانی گەل هانبدرێن كه شانازی به فۆلكلۆری خۆیانەوە بكەن و نرخی بۆ دابنێن و بەهانایەوە بچن.

3- سەرچاوە مێژووییه جـیهانییەكان،كه فـــۆلكلۆریكـوردییان تێدا بڵاوكرایتەوە بهێندرێنه كوردستان، یا بەلایەنی كەم فۆتۆ كۆپییان بێنن و بڵاویان بكەنەوە.

4- كـۆمەڵەی فـۆلكلۆر پەروەران دابمەزرێندرێت و دەستی لێزان و خاوەن بەهرە و خـــەمخۆر و كۆڵنەدەرەكانیان بـــگرن دەســـەڵات و شوێنی شـــیاویان بۆ دابین بكرێت.(ئێستا شتێك لەم بابەته له هەولێر و له سلێمانی هەیه بەڵام جموجۆڵ و چالاكییان وەك پێویست ناكەوێته بەرچاو)

5- بڵاوكراوەیەكی (گۆڤارێكی) تایبەت به فـــۆلكلۆر هەبێت و كادیری دڵسۆز وبەتواناو شارەزا، بـودجەی پێویست، ئـامراز و تەكنیكاری تـەواوی بۆ دەستەبەر بكـــــرێت، بـۆئەوەی بەرهەمه كـــــۆكراوەكان و لێكۆڵینەوەكانیان تێدا

بڵاوبکرێتەوە.(کۆمەڵێك گۆڤار ناوە ناوە لەم بوارەدا چەند ژمارەیەکیان لێ دەرچووە و وەستان وەك :فۆلکلۆر- سلێمانی، فۆلکلۆر- هەولێر، کـــاروانی فۆلکلۆر- هەولێر، لاوك – هەولێر، ئاسۆی فۆلکلۆر – هەولێر، کەلەپوور- سلێمانی، دوا گۆڤاریشیان ئاسۆی فۆلکلۆر- هەولێرە.

6- تیپی گەڕۆك و بەتوانا لە بواری گۆرانیی کوردی و هەڵپەڕکێ و شانۆی میللی و ... دابمەزرێت و چالاکییەکانیان لە دەرەوە و ناوەوەی هەرێمدا پێشکەش بکەن.

7- مۆزەخانەیەکی شیاو بۆ پاراستن و پیشاندانی بابەت و شتە فـــۆلکلۆرییەکان بکرێتەوە، (ئێستا لە قەڵای هەولێر مۆزەخانەیەکی بچووك و شاردراوە هەیە بەڵام ئەرکی خۆی نابینێت) دەکرێت مۆزەخانەکە وەك مـــۆزەخانەی( بەغدادیات)ی کۆن بێت و ببێتە شوێنی سەردانی خۆمان و بیانییەکان.

8- بۆنە و بیرەوەرییەکانی وەك جەژنەکانی ئادار و نەورۆز بۆ بوژاندنەوەی کەلتوورە میللیەکان بقۆزرێنەوە.

9- یارمەتی تاك و کۆمەڵە نووسەرانێك بدرێت کە دەتـــوانن و دەیانەوێت بەرهەمی فۆلکلۆری نایاب بڵاوبکەنەوە.ساڵانە ڕێز لە چەندکەسی شیاو بگیرێت .

10- هەوڵبدرێت داب ونەریت و بەرهەمە فۆلکلۆرییە باشەکانمان وەربگێڕینە سەر زمـــانە جـیهانیەکان و بە جیهانیان بناسێنین. ئێستا چـــــاپکردن و بڵاوکردنەوە لە سایتی ئەنتەرنێتەوە گەلێك ئاسان و کاریگەرە.

## مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی چییە ؟

**لە زمانی كوردیدا گەلێك زاراوە بە مانای مەتەڵ بە كاردێن وەك: مەتەڵ ، هەتەڵە، مەیل، هەڵێنە، چەوچە، مامك ، تیٚدەرخستۆك ، تشتانۆك ...**

**لە زمانی عەرەبیدا زاراوەی:( لغز، معمّا، حزورة، الأحجية، العويص...) بۆ بەكاردێن**

**ئینگلیزیش: Puzzle, Conundrum, Enigma, Mystery,Riddle, Secr پیێ دەڵێن**

**مەتـەڵی فۆلكلـۆری كـوردی، دەقـی پرسـیارێكی كـورتبڕی فۆلكلۆرییـە، بەشـێوەی هۆنراوە داڕێژراوە وەك :**

((چەرمم دەرهێنا ڕەقی لەگەڵ هات... لەناوم دانا، دوو جاری پیا هات...

لەگەڵ دەرهێنان ئاوی لەگەڵ هات؟))

**وەڵام: (كلدان، كلچووك، كل لە چاوكردن، فرمێسك)**

**یا بە شـێوەی پـــــەخشانە وەك :** ((كـانی چەرمە، ئاو بەردە، كندر دەزی، دەولك شاخە؟)) (كلدان و كل ودەزوو و كلچووك)

**زۆر جاریش پەخشانەكەی ئاواز و سەرواداره، بە زۆری لە دەقەكەدا پرسیار لە شتێك یا چەند شتێك دەكات، لەگەڵ پرسیار كردنەكەشدا هەندێك نیشانە و هێمای زۆر تایبەتمەند بە شتە پرسیار لیٚكراوەكە دەردەبڕیٚ، بۆئەوەی بیستەر لە میانییەوە بتوانێت گریٚكوێرەی پرسیارەكە بدۆزێتەوە و مەتەڵەكە وەك مـــریشكە كڕ هەڵبێنێت، بۆنموونە كە دەڵێن** ((نەچاندی لە نەزای بكەی، نەزای لە نەنووستی بدەی؟)) **مەبەستیانە بیر لە شتێك بكەیتەوە كە نـــاچێندرێت و خـــەڵك پێویستی پێیەتی، ئەویش خوێیە. خــــــویٚ لە بارهەڵگرێكی ئەوكـــاتەدا باربكرێت كە هەرگیز نەزێت، ئەویش هێسترە. هێسترەكە لە ڕێگەدا لە ئـــاوی ڕووبارێك دەدا، ئاوی ڕووباریش شەو و ڕۆژ دەڕوا و وەستان و خەوتنی نییە. یا دەربارەی شەمشەمە كوێرە دەپرسن چ گیانلەبەرێكی شیردار هەیە بفڕێت** ((لە تەیرەكانا كامیان شیردارە؟)).

**هەندێك دەق لە ناوەڕۆك و ڕوخساردا تایبەتن بە كۆڕی زانا و پیاوماقوڵان وەك:**

((سواری کەس نەبەزاندی، لانکی کەس نەهەژاندی، باخی کەس نەچەقاندی؟)) **مـردن و گــۆڕ و بەهەشت. لە نێو دەقەکاندا هەورازەخەت دروست دەکرێ، بۆ ئەوەی بیستەر دەسخەرۆ بدەن، بۆیە دۆزینەوەی وەڵامی ئەو مەتەڵانە زیرەکی و وشیاری و قووڵی و بیری تیژی دەوێت.**

((شتێك هەیە لە چیایە، سپیاتی سپیانی تێدایە، ناوی گێزەر گیایە، جەرگم بووە کوون کوون، کوندەڵانم بێننە کن؟)) ژاژی .

**هەندێکیشیان بۆ مرۆی ساویلکە و تام گێل و هەرزەکارە، ئاسانکاری و ڕێنمایی کردنێکی خۆشی دەداتێ. کە وەڵامەکەیان بە ئاسانی وەگیر دەکەوێت. وەك:**

((بی تەڕتاڵە، لێو تەڕە دوونە؟))، ((من باوکی خۆم لە ناو لانکدا دیوە؟))

**بـۆ گاڵتـە و پێکـەنین و خـۆش دەمـاخی و سـاز و سـۆبەتی کـۆڕی مەتـەڵ پرسـین، گوشار دەخرایە سەر مەتەڵ هەڵهێنەکان و هەندێك جنێوی تـەڕو قسەی مزریـان لـەناو مەتەڵەکانـدا بـە شـێوازی تـوانج پـۆش دەرخـواردەدان، گـەلێك مەتـەڵ بـە شـێوازێکی سێکسی ئامێز داڕێژراون، تاکو مەتەڵ هەڵهێن چیان لـە توانا دابێت درێخـی نەکـەن و کۆڕەکـە سـارد نەکـەنـەوە، بـەڵکو پـتر هـەوڵ بـدەن بـۆ هەڵـدانی مەتەڵـەکان و خۆیـان لـە جنێوەکـان دەربـاز بکـەن.وەك:** -((ئاڵـدم باڵـدم، شـەش پێـی دووسـم، ئەگـەر نـەیزانی(هـەڵی نـەینی)، پۆپیتەی دەگرم، پێی(پێت)دا دەفسم؟)) **لێرەدا (پۆپیتەی) یا (پۆپیتەت) بۆ کابرای بەرامبـەر و پۆپیتەی تەرازووەکە کراون بە یەك و بەهێمنی لە پەناوە جنێوەکە دراوە ،بەڵام ئەگـەر بەرامبەر وەڵامەکەی نەزانی ئەوا بە ئاشکرا جنێوەکە دەخوا.**

**کە بیستەر وەڵامی مـــەتەڵەکەی نـەدەزانی، لە هەڵـــدانی(پێگوتنی) مەتەڵەکەش دوبارە دەیان شووشتەوە و دەیانگوت:**(( هەڵت دەم، پەڵت دەم، لە گـووە شلەی مام **حــاجیت** وەردەم، دەرگــات لـەسەر سواقدەم، بۆ ناڵێی: تەرازووە.)) **یا دەڵێن:–** ((تا وەك پشیلەی مێیە نەمیاوێنی، یا ... وەڵامەکەت پێ‌ناڵێین!)).

**ئافەرین و مزگێنی و قسەی خۆشیش دراوەتە بیر تیژ و زیرەکەکانی مەتەڵەکان دەزانن وەك:–** ((چـــوار باڵ و سەرێ، دایم بەدەوە، دوڕو جەواهێر مەکانی ئەوە، زەردی خۆر ئاوا لێش بەئەنێشە، هێستریٚ مزگێنی بزانی چێشە؟)) **وەڵام(ماسی)**

((قەلأی گۆشتن، میراوی ئاوە، هەرچی هەلّیدا، ئاقلّی تەواوە؟)) **وەلأم (ماسی).**

**رەگەزەکانی رەوانبێژی وەك:- کورتبڕی و درێژبڕی و خوازە و خواستن و رەگەزدۆزی و لەیەك چواندن و تیلنیشان و تێکهەڵکێش و دژیەك و توانج پۆشی و درکە و... لە نێو دەقی زۆر مـــەتەلأندا بەدی دەکـــرێن کە لە لێکدانەوەو راڤە کردنی هــــــەندێك مەتەلأندا دواتر بە کورتی ئاماژە بە چەند نموونەیەك دەکەین.**

**هەرچەندە مەتەڵ و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و تا رادەیەکیش ئیدیۆم (درکە) بابەتی فۆلکلۆریی سەربەخۆ و جیاوازن، مەتەڵ پرسیارێکە و وەڵامی دەوێ، پەند و قسەی نەستەقیش بەسەرهات و وتەی جوان و چڕ و کورتبڕ و پڕمانان، رستەی ئامادەکراوی بەردەستن و بێژەر بـــــۆ پشتگیری و چەسپاندنی بابەت و بۆچوونی خۆی بەکـــاریان دێنێ، ئیدیۆمیش بـــــۆ دەربڕینی ناراستەوخۆیە و رەوانبێژی دەنوێنێ، بەڵام لە زۆر دەقی فۆلکلۆریدا ئەم بابەتانەی سەرەوە راستەو خۆ یا ناراستەو خۆ سوودیان لە ناوەرۆك و روخساری یەکدی وەرگرتووە،**

**هەر بۆ نـــموونە: دەقیهەندێك مەتەڵ زۆر لە ئیدیـــۆم نـــزیك دەبێتەوە وەك:** ((نانەخۆرەی پێنج ئەنگوست چییە؟)) **مـــــەتەڵێکی مندالأنەیە،** (چیە)**کە لادەیت ئیدیۆمەکە دەردەکەوێت.** ((شەو لە بان[45]))ە **بۆ مەتەڵی مندالأنە و وەك ئیدیۆمیش بەکارهـــاتووە**[46]**، بەڵام لە مەتەڵدا داوای وەڵام دەکـــات. هەر وەها وەك ئیدیۆم بۆ مرۆی بێ بار و بێ بەر و پشت دەڵێن:**((فلانە کەس نیسکە، بەر و پشتی نیە.)) **پیرەمێردی نەمریش لە پـــەندەکانیدا گـــوتویەتی:** ((نیسکی مۆریاس و هەرزنی رەنگاڵ...بێ بەر و پشتن بۆ کەس نابنە ماڵ[47]))**،هەر وەها وەك ئیدیۆم دەڵێن** ((وەك نیسك بەرو پشتی بۆ نییە[48])).

**لە مەتەڵیشدا بو نیسك بە تیل نیشانی ئیدیۆمەکە گوتراوە:-**

---

45- **هیوا عومەر ئەحمەد** (1985) **ئەدەبی فۆلکلۆری مندالأن، نووسەری کورد،** ژ 4، ل 66.

46- **جەلال مەحمود عەلی**(1982) **ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا،** ل 273.

**47- پەندەکانی پیرەمێرد (کاکەی فەلاح) (1982)، بەرگی یەکەم ،چاپی دووەم، ل107 .**

**48- جەلال مەحمود عەلی (1982) ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، ل 479.**

((ئەوە چییە پیاوی سپڵە، نەبەری هەیە نە پشتە؟))

**لە مەتەڵەکە ناوی نیسك لابراوە و پرسیار لە ناوەکەی دەکات. لە قسە نەستەقەکە و ئیدیۆمەکەدا نـــاوی نیســــك دێت ،بـــەڵام مەبەستی مرۆڤێکی سپڵە و بێبار و بێبەروپشتە.**

**جاری واش هەیە سەرسەدەی مەتەڵ لە گەڵ پەند و قسەی نەستەقدا دەگاتەوە یەك وەك** ((چییە ؟ هەرتم لە مـــاڵە، گەھ شـــەکرە، گەھ تاڵە؟))، ((چییە دۆستی خوتە ودوژمنی خۆتە و هەر لەخۆتە؟)) **وەڵام (زمان). ئەگەر چیەکە لابدەیت ئەوا دەبێتە پەند یا قسەی نەستەق, دەقی ئەم مەتەڵەی سەرەوە خواستن و کورتبریشی تێدایە،(دوژمن، دوست) یا (شەکرە، تاڵە) دژیەکن، (ماڵە،تاڵە) رەگەزدۆزی ناتەواوە.**

**دوو دەقی مـــەتەڵ کە بۆ** (پێڵاو، کـــارەك، کـــاڵەکی لە چەرمەگا دروستکراو) گوتراون: 1- ((بەدەوری پیر و پێشان، بزن لەسەر گامێشان؟)).

2- ((سەری یخەیە، بنی ئۆحەیە، لەکن خوشکەیە؟))

**(یخە وشەیەکە بۆ دەنگدانی بزن و ئۆحە بۆ دەنگدانی گا وگامێش بەکاردێت و خوشکەش هیمایە بۆ ئەو مرۆڤەی پێڵاوەکە دەکاتە پێی.)**

**لە نێو پەندەکانی پیرەمێردا ئەدۆزینەوە کە ئەڵێ:-**

((**پێشینان دەڵێن**:خوا هەر ئەو خوایە...ئێستاکە بزن وا سواری گایە[49]))

((بزنیان سواری گامێش کــــــردووە...تۆیش سواری دەبی کەچی مردووە.[50]))

**پیرەمێردی نەمر لە زۆر شـــوێندا بە تێکهەڵکێش پـــەند و مـــــەتەڵی بەیەکەوە نووسیون، نموونە:- مەتەڵ:**

((ئەم لای دیوار، ئەو لای دیوار، ناوەڕاستەکەی سەگێکی(گورگێکی) هار؟))

**پیرەمێردیش نووسیویەتی:**

((خوا خۆی ئەیزانی زبان ناوەستێ... هێنای حەپسی کرد هاوێشتیە بەستێ،
لە پووك و لە دان کردیە دوو دیوار...دوو لێو بە سەریا دیوار بوو بە چـــوار،

---

49- **پەندەکانی پیرەمێرد (کاکەی فەلاح) ، ب 1 ، چ 2 ، ل110 .**

50- **پەندەکانی پیرەمێرد (کاکەی فەلاح) ، ب 4 ، ل58 .**

بەم چوار دیوارە هێشتا بەند نابێ... ئەبێ لــــەوەوە گەردوش بەرپابــێ
مــەتــەڵی کــوردی بۆ رێك خراوە ... بــە گـورگێـکی هـــار نــاوی بــراوە:
ئەملای دیوارە و ئەولاشی دیوار ... حەپسخانەیە بۆ گــــورگێکی هـــار.
لەگەڵ ئەوەیشا کاتێ دەرفەت بێ ... نــایەڵێ ســەری خـێوی رحەت بــــێ
خۆ ئەگەر بێتە سـەر باری چاکە ... لە هـەمــوو عضـوی بەدەندا تـــــاکە[51]))

لەم دەقەی سەرەودا تێکهەڵکێشی مەتەڵ و قسەی نستەق و پەند وبابەتەکانی رەوانبێژی وەك: کورتبڕی و راڤەکردن و درێژبڕی و جوانی بایس و درکە و ... بەدی دەکرێن، سەرەڕای مەتەڵ و پەندی نێو دەقەکە، بە تیل نیشان چەند مەتەڵ و پەندی دیکەشی تێ ئــاخنراوە وەك: ((زمانت بگری ســـەرت سەلامەتە))، ((زمان بەڵای سەرە))، ((خراپە وچاکە بە زمانی دەکرێ )) هەر وەها نــــاوەرۆکی مەتەڵەکانی: ((چیە هەرتم ل مــاڵە، گەهـ شــەکرە، گەهـ تــاڵە؟))، ((ژ ژەهرێ تاڵترە، ژهنگڤینی شیرینترە؟))ی گرتۆتەخۆ..ناوەرۆکی ئەم ئیدیۆمانەشی لە نێودا دەدۆزرێتەوە

.((زمان شیرین– رووبەڕوو دەم چەور، پاشملە دەم تەور– زارخۆشی زگ رەش– دووزمان – زمان لووس – زمان پیس – دەم بۆگەنی...[52]).

ئەگەر بڕوانینە دەقی مەتەڵی:

((ئەم لای کەڵەك، ئەو لای کەڵەك، ناوەڕاستەکەی چەرخ و فەلەك؟)) کە بۆ هەمان مەبەست و هەمـــان واتا گوتراوە، چەرخ و فــەلەك هیمایە بۆ زمان، چەرخ و فەلەك لە کۆنەوە وەك ئەفسانە و خەیاڵی زانستی لەجیاتی فـــڕۆکە و کــەشتی ئاسمانی ئێستا بەکارهاتووە. هەر لە بارەی ئەفسانە و مەتەڵەوە دەڵێن:

((پاشایەك تاکە کچێکی جحێڵ و زۆر نازداری هەبوو، رۆژێك دێوێك خۆی دەکاتە کۆتر و دەچێتە ناو باخچەی پاشا و کچەکە دەڕفێنێت، پاشا بانگ رادێری و داوا لە خەڵکەکە دەکات بەڵکو بە هانایەوە بچن و کیژەکەی بۆ بێننەوە، پەیمانیشیدا و گوتی: هەرکەسێك کچەکەم بۆ بێنێتەوە، کچەکەمی دەدەمێ و دەیکەمە زاوای خۆم، لە

---

51– پەندەکانی پیرەمێرد (کاکەی فەلاح) ، ب 4 ، ل 142–143 .
52– جەلال مەحمود عەلی(1982) ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، ل284,292، 295,296.

بەرەبەیانی رۆژی سێیەمدا سێ کەس چوونە دەرباری پاشا و ئامادەیی خۆیان بۆ کارەکە پیشان دا، بردنیانە ژووری پاشا،پاشا لە یەکەمیانی پرسی: تۆ چ بەهرەیەکت هەیە و چۆن دەتوانی کچەکەم بۆ بێنیتەوە؟ ئەویش دەڵێ:- دەتوانم بزانم دێوە و کچەکەت، یا هەرکەسێکی تۆ دەتەوێ ئێستا لە کوێیە (پاراسایکۆلۆجی). دووەمیش گووتی: هەرکەسێك تـــۆ بتەوێ بینێریتە هەر شـوێنێك، هەرچەندە دووریش مـــن دەتوانم سواری چەرخ وفەلەکی بکەم و بە چاوتروکانێك بیگەینمە شوێنی مەبەست. سێیەمیش گوتی: منیش پاڵەوانێکی ئەوەندە بوێرو بەهێزم، هەرکەسێکت دەوێ لەگەڵیا بجەنگێم، دەیبەزێنم، هـــەتا ئەگەر دێویش بـــێ. یەکەمیان ســـەیری ئاوێنەکەی کرد و شوێنی کچە و دێوەکەی نیشان دان، دووەمیشیان چەرخ و فەلەکی داگرت و پاڵەوانەکەی سوار کرد و فڕاندی و گەیاندییە ماڵی دێوەکە. پاڵەوانیش لەگەڵ دێوە کەوتە شەڕە گورز و شیربازی دوای حەفت رۆژان کوشتی و کچەکەی لەگەڵ خۆیا سواری چەرخ و فەلەك کرد و هێنای لە باخچەی پاشای نیشتنەوە، ئایا کچەکە دەدرێتە کامەیان و بۆچی؟)) وەلام: (دەبێتە هی ئەو کەسەی کە پتر ژیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە.[53])

لەنێو دەقی هەندێك مەتەڵی دیکەدا فەنتازیا و ئەفسانە و بەسەروەنان و... بە ئاشکرا بەدی دەکرێن، لەم دەقەی خوارەوەدا دەبینین کە کوچکئاگر(بەرداگر)) زۆر گەورە کراوە و کراوە بە گرد، سێڵ یا مەنجەڵ کراوە بە دێو کە دەعبایەکی ئەفسانەییە، شیشەی ئاسنیش کە ئاگرەکەی پێخۆش ئەکرێت کراوە بە نۆکەر...

((سێگرد بەرامبەرە، دێوی رەشیان لەسەرە، کلك قوتەش نۆکەرە؟))

وەلام : (سێکوچکە و سێڵ (مەنجەڵ) و شیشەی ئاگر)

((دێوە رەشی ئاسمانە، گورزی هەژدە باتمانە، چاوی پڕ لە گریانە؟))

(هەور و بروسك و باران).

---

53- لە مامۆستا کەریم شارەزام بیستووە.

1-((بەگــــزادەی چۆغەر بوزی[54])) و 2-((دونیــا سێبەرە هــەتا بچییە دووی نایگەیێ [4])) وەك پەندی پێشینان تۆمارکراون، یەکەمیان وەکو خۆی بەبێ‌زیاد و کەم و دووەمیشیان ((دونیا سێبەرە))ی لابدەیت دەبنە مەتەڵ و لە زۆر سەرچاوانیش وەك مەتەڵ تۆمارکراون.

شارەزایان دەڵێن میــژووی سەرهەڵدانی مەتەڵ لەگەڵ پەیدابوونی قسەی نەستەق و پەندی پێشینان جمکن، هەندێك مــەتەڵ تەمەنی نوحیان هەیە، وەك: ((رەقە بە رەقی دەکەوی، سوورە بە نەرمی دەکەوی؟) ئەستێ و بەرد و ئاگرو پوش،

((چوومە هەردێ، لەبن زەردێ، دارێ بەچەپۆك ئەیدا لە بەردێ.)). ((زاری لە پشتی، بۆخۆی لەبەردی، هێـــزی بە ئاوە.؟)). ئاشی ئاو. هەندێکیشیان لەتەمەنی ئێمە دان وەك:((گیسکێ گۆڕی، لسەر ئاڤێ نڕی؟)) ماتۆڕی ئاو.

((دارا چل ئاواز؟)) رادیــۆ. هەندێکیشیان تــام شیری خاویان لە دەمی دێت وەك ((سەر خڕی ناو بۆش؟)) ( پیاوێك ناوی مستەر بۆش بێ)

زۆرجار هــەندێك وشــەی شێوەزارێك لەگەڵ دەقی بابەتێکی فــۆلکلۆری بە ناوچەکانی دیدا بڵاودەبێتەوە و تاماوەیەکی دوورودرێژ دەمێنێتەوە، نموونە:- لە ناوچەی هەولێر دەڵێن:- ((ئاوی خورتان سەرهەوراز دەڕوا)) یا دەڵێن ((فلانە کچ بە فیسکە کوڕ ناشێ)) ، (خورت و ناشێ) دوو وشەی بادینین و لە هەولێر لە نێو هەردوو دەقی ناوبراودا خەڵك مانایان دەزانێ، بەڵام بۆ مانا فراوانەکانیان بەکاریانیەن.

## بایەخ و سودی مەتەڵی فۆلکلۆری چییە ؟

بابەتەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر هەندێك سوودی هاوبەش و هەندێکی تایبەتمەندیشیان هەیە، چونــــکە لە ئەنجامی ئەزمــــــوونەوە رۆژگــــــار لە ســەنگی مــــەحەکی داون و نرخدارەکانیان بە زمانێکی رەوان و ساکار بڵاوبوویتەوە و بوونەتە مولکی گشتی و

---

54 - عومەر شێخەڵلا دەشتەکی ((پەندی کوردی )) ل 127و 143، بەغدا.

هەمـــوو چـین و توێژ و بگرە تاکەکـانی کـۆمەڵ، لە گفتار ورەفـتاری رۆژانەیاندا سوودیان لێ وەردەگرن، پیرەمێرد دەڵێ:.

((گوێ لە پیران و باپیران بگرە... لە هەر خەساریێ پەندیێ وەربگرە[55]))

## سوودەکانی مەتەڵی فۆلکلۆری ئەمانەن:

1- رۆڵێکی گرنگ لە زاخاودانی مێشك دەبینێ، و هانی بیرکردنەوەیان دەدات.

2- پرسیار و تاقیکردنەوەیەکە، زیرەکی و هۆشیاریی و قووڵی و بیرتیژی کەسەکان دەردەخات

3- تێکەڵاوبون و شەرم شکاندنێك بەتایبەتی لە نێومێردمنداڵدا دەرەخسێ.

4- ئەوکەسەی مەتەڵەکە هەڵدێنێ، هەست بە خۆشی و سەرکەوتنێك دەکات و لە لایەنی دەروونیشەوە باوەڕی بەخۆی پتەوتردەبێت.

5- رەوانبێژی و دەمڕاستی بیستەرەکان دەنوێنێت، بەتایبەتی لە کـــۆڕی بابەتی تەتەڵەی زماندا.

6- گەلێك مەتەڵی مەبەستدار وانە گوتنەوە و فێرکردنی باشی تێدایە، بڕوانە بابەتی مەتەڵە ئاینییەکان، نموونە: ((ئەوەچییە :. سەری نانی بنی نانی؟))

لە سەرەتای نانخواردن دەڵێین :. بەناوی خودا (بسم الله) و لە کۆتایی نانخواردنەکەش هەردەڵێن دەڵێین سوپاس بۆ یەزدان (الحمد لله)

7- لەجێی تەلەفزیۆن وسەتلایتی هەنووکە، شـــانبەشانی چـیڕۆك و داستان و ئامرازی کات بەسەربردن بووین و مەتەڵیش لە هەموویان پتر خەمی بە باداوە.

---

55- پەندەکانی پیرەمێرد (کاکەی فەلاح) ، ب 4 ، ل 187 .

8- وشه و زاراوەی ڕەسەنی کوردییان تێدایە، ڕەسەنایەتیی زمان دەردەخەن و دەکـــرێت وشـــەکان بۆ مانـــــــا و مەبەستی دیکە بەکـــاربێن و زمـــانەکەمـــانی پێ دەوڵەمەندتر بکەین.

9- بــــاری ژیــــانی دێرینی نەتەوەکە لە زۆر لایەنەوە دەردەخــــات. لە میانی شێوازەکەیەوە نــــــاوچەکەی و تا ڕادەیەکیش سەردەمەکەی دەنــاسیتەوە، بە هۆی ناوەرۆکیشیەوە دەزانرێت کە چ ئامرازێکی بەکارهێناوە ولەگەڵ چ ئاژەڵ و باڵندە و گیانلەبەرێك ژیــــاوە و چ کارێکی کردووە و چـــۆنی ئەنجامداوە، بــاری ئابووری و مێژووی ڕابردوو و کەلتووری پێشینان دەداتە دەست.

10- زیرەکایەتی و قووڵی وبیرتیژی وچۆنیەتیی بیرکردنەوەی نەوەکانی کۆنینەمان بۆ دەگێڕێتەوە ...

## بۆ مەتەڵی فۆلكلۆریم هەڵبژاردووە؟

لە كۆنەوە زۆربەی هەرە زۆری كۆمەڵگەی كوردەواری، خەریكی كشتوكاڵ و ئاژەڵـداری بـووە و زۆربەی هەرەزۆری دەقـی مـەتەڵەكانیش لەم روانگەوە هەڵقولاون، منیش لە منداڵیمەوە و راستەوخۆ لە زۆبەی كارە كشتوكاڵییەكانی وەك : شوانی و سەپانی بژار و تەرییش و تـووتن شكاندنەوە و هەنار رنین و ترێ فرۆشتن و ...كارم كردووە و لە مـەتەڵ هەڵهێنانیشدا زیخ و زیـرەك بـووم، مەتەڵێكی زۆریشم لەبەرە، كە دەقێكی مەتەڵی فـۆلكلۆری بە قرتاوی و ناتەواوی بڵاودەكرایەوە، یا وەڵامەكەیان بەهەڵە لێكدەدایەوە، زۆر نیگەران دەبووم و خەمم لێی دەخوارد، دەشمزانی كـارەكە بۆمن گەلێك شاراوە و دژوار نییە بۆیە بڕیارمدا خۆمی تێوە بگلێنم، گـوتم كـاتی قووڵبونەوە و بەراورد و سـاخكردنەوە هاتووە، تەونی پڕۆژەیەكی تاكە كەسی درێژخایەنم راچاند، وەك ئارەزوومەندێك بەپێی دەرفەت، بە پچرپچری بەڵام بە هەناسەیەكی دریـژ و بێوەڕسـبوون، مـاوەیەكی بـاشە كاری تێدادەكەم، زۆر دڵسۆزیش یـارمەتییان داوم، سەرچاوەیـان بۆ هێناوم و مەتەڵی جوانیشیان بۆم ناردووم، خۆیشم بەپەرۆشەوە زۆر ناوچان گەڕاوم و لە دەرگەی زۆر كەسانیشم داوە، بەڵام دەبێ بزانین كاری تاكەكەسی هەرچەندە هەوڵی بۆبدرێت و لێی بخەفتی، هەرگیز ناگاتە كاری پوختی كۆمەڵەیەك یا دەزگایكی تایبەتی خاوەن دەسەڵات و توانا. ئاگادارم تا ئێستا چەندین نامیلكەی تایبەت بە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی چاپكراون، وەك:

1- سـەردار فەتاح (1977) خەرمانێك لە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی.

2- فەخرەدین رەئوف ( 1978) چەپكێك لە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی.

3- بـڕەك ئـەیوبیان (1982) هەتەڵەی كوردی – ئێران–مهاباد.

4-ئەحمە عەبدوڵا زەرۆ(985) مامكێن كوردی / بەغدا. ...

وێڕای ئەو گۆڤار و كتێبانەی بە شێوەیەكی گشتی بـابەتی فـۆلكلۆرییان بڵاوكردۆتەوە، بە بۆچوونی من تا ئێستا مەتەڵی كوردی كاری پێویستی بۆ نەكراوە. هەركەسێكیش بیەوێ لەم بوارەدا رەوسەیەكی باش هەڵبگرێت و بەرهەمێكی بە پێز بڵاوبكاتەوە، ئەوا دەبێت سوود لە سەرچاوەكانی پێشەخۆی وەربگرێت و هەوڵیش

بدات لەوان تێپەڕبكات، ئەگەر هەر لەناو هەمان بازنەدا بسووڕێتەوە ئەوا كۆششەكەی بە فیڕۆ دەڕوات.

ویستوومە مەتەڵە كوردییەكان لە كوردستانی گەورە و ناوچە كوردنشینەكانی وەك : یەریڤان و ئازەربایجان و ئێران و توركیا و سوریا و لایخۆمان كۆبكەمەوە.

زۆریش هەوڵم داوە زۆرترین دەق لەو شێوەزارە بەكاربێنم كە كەوتۆتە ئەم بەر و ئەو بەری زێی بادینان، بەتایبەتی نێوان كەڵەكی یاسیناغاو بەردەڕەش، هەریر و ئاكرێ (زرارەتی و گـــــۆران و سورچی و خـــەیلانی و كرو و هەركی) هەروەها نێوان سۆران و مێرگەسوور و سیدەكان، هەندێك ناوچەی ( شنۆ)ش چونكە بادینییەكەیان تامی سۆرانی دەدا، سۆرانییەكەشیان بۆنی بادینی لێدێ، باشترە بڵێین شێوە زارێكی سۆرمانجیە، بە بۆچوونی من بەكارهێنانی ئەم شێوەزارە بە شێوەیەكی سەرەكی و بەربڵاو هاندەرێكی چاك و لەبارە بۆدروست بوونی زمانێكی یەكگرتوو، بۆ نووسین و زانست بـــڵاوكردنەوە لە سەرتاسەری كـــوردستاندا، چونكە باشترین دیالێكتی هاوبەشە و زۆرترین كورد تێیدەگا یا زۆر بە ئاسانی فێری دەبن، بەمەرجێك نیازمان پاك بێ و بە دڵسۆزی كاری بۆ بكەین، چارەی كەموكورتییەكانیشی بە وشە و زاراوەی پەتی ئێسك سووك و گونجاو لە شێوەزارەكانیدیدا بكەین، ئەوەیان گەلێك ئاسانترە لەوەی كە هەوڵدبدرێت شێوەزارێكی یەكگرتوو بۆ نووسین، بە پینە پینە و بە كۆكردنەوەی وشە و زاراوەی جۆراوجۆر لە ناوچە جیاجیاو دیالكێكتە جۆراو جۆرەكان دابڕێژرێت، كە كارێكی زۆر ئاڵۆز وئەنجام نادیارە.

## هەڵسەنگاندندن و لێكۆڵینەوەی مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی[55]

نەتەوەی ئێمەش وەك هەر نەتەوەیەكی ڕەسەنی دیكەی سەر ڕووی ئەم وشكاییە، خاوەنی زمان و مێژوو و داب ونەریتی تایبەتی خۆیەتی، لە فۆلكلۆریشدا ئەگەر لەوان دەوڵەمەندتر نەبێ هەرگیز هەژارتر نییە. بەلاّم بارودۆخێكی گونجاوی بۆ نەڕەخساوە و هەڵێكی بۆ هەڵنەكەوتووە كە بتوانێ بە پوختی كۆیبكاتەوە و بلاّویبكاتەوە، تا خۆی بەتایبەتی و مرۆڤایەتیش بەگشتی سوودی لێوەربگرن. لە پێش ئێمەدا بیانییەكان هەستیان بەم گیروگرفتە كردووە، بۆیە ڕۆژهەلاّتناس و گەڕۆكەكان لە كۆنەوە (جا بەهەر مەبەستێك و بۆ هەر ئامانجێك بووبێ) لێرە و لەوێ زۆر بابەتی مێژوویی‌و فۆلكلۆرییان كۆكردۆتەوە و وەریان گێڕاوە و چاپیان كردووە. بەڵگە نەویستە و هیچ پێویست بە ڕوونكردنەوە و بەراورد كردن ناكات ئەگەر بڵێین: بیانییەك لەهەندەرانڕا بێت و لەگەشتێكی سەرپێییدا، ئەدەبی سەر زارەكی لە كۆمەڵێكی نەخوێندەوار و پەرت و بلاّو و پەژموردە كۆبكاتەوە، هەرگیزاوهەرگیز وشی لەدوای ئەم ئەدەبە فۆلكۆرەییە ناكات كە ڕۆڵەی ڕۆشنبیر و دڵسۆز و هاوزمانی هەمان نەتەوە لەناو جەرگەی كۆمەڵەكەی خۆیاندا كۆیبكەنەوە. بۆیە دەبێتە مایەی بەختەوەری و شانازی كەوا ڕۆشنبیری خەمخۆری نەتەوەكە، فریای كۆكردنەوەی بكەون و لە فەوتان ڕزگاری بكەن، بەتایبەتی كە ئێستا ڕەوڕەوەی گۆڕان و گۆڕانكاری كۆمەلاّیەتی و... زۆر بە خێرایی دەخولێتەوە و بەرەو شارستانیەتێكی فراوان و نادیار و تەماوی مل دەنێت و كەلتووری پێشینان و ئێستامان بەرەو گۆڕدەچێت، بۆیە زۆر وریانەبین لە ڕابردووی خۆمانا دادەبڕێین، هەر میللەتێكیش ڕەسەنایەتی و ڕابردووی خۆی بزر بكات گومڕاو سەرلێشێواو دەبێت وخۆی بۆ نادۆزرێتەوە.

---

55 – لە گۆڤاری (كاروان) ژمارە 119 ساڵی 1998 بلاّوكراوەتەوە. دەسكاریم كردۆتەوە.

ئەگەر هــەر کـەسەو لەگۆلکە (گوێرەکە) سووریێك بپرسێتەوە، ئـەوا گەلە و گاڕانمان بە گردەوە بێسەروشوێن ناڕوات. بــە تۆمارکردنی فۆلکلۆر و دابونەریتەوە زۆر شتیمێژوویی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و...هتد گەلەکەمان لەدەست نــادەین. زۆر کەرستەی خــۆمالیی ڕەسەن و زیندوو بــۆ نەوەکــانی داهاتــوومان دەپارێزین. کە ئێستا بێ ناز و کــەم نــرخن، ئەوکاتیش بە هــیچ نــرخێك دەست ناکەونەوە، بۆ نموونە:-

مـامۆستای خوالێخۆشبوو (تۆفیق وەهبی) دەربارەی وشە و وشە ڕۆنان لە سەرەتای حەفتاکاندا نوسیبووی (کە بە تەواوی دەقەکەیم لە یاد نەماوە) گوتبووی :- من کە دەستم بە نووسینی ڕیــزمانی کــــوردی کرد، بۆ زۆر زاراوەی سەرەکیی دادەمام، بۆ جێگری (الجملة = رستە) بە کوردی زۆر گەڕام، بەلام دوا جار (رستە)م بەکارهێنا، ڕست- ڕاوکەر لە مــلی تــاژی دەکات، چــەند داوێك بەیەکەوە دەهۆننەوە دەبێتە رست (هەروەها رستەی جلکان بە مانای تەنافی هەلخستنی جلکان دێت)، جا چەند وشەیەك کە بەیەکەوە ببەسترێنەوە و مانایەکی پڕ واتا ببەخشن (رستە) پڕ بەپێستە. هەروەها د.ڕەحیمی قازی لە لاپەڕەی پێنجەمی ڕۆمانی ((پێشمەرگە))، چ 2، سالی1359دا دەلێ: ((کاتی دامەزرانی کۆماری خودموختاری کوردستان پێشەوا قازی محەمەد کە گرینگییەکی زۆری ئەدا بە زمان و ئەدەبی کوردی، ئەسپاردبووی لە جیاتی ووشەی سەربازو عەسکەرو نیزامیو فیدایی وشەیەکی جوانی کوردی بدۆزرێتەوە و بەکاربهێندرێت. جا ریزەیەك لە نووسەران و هونەران و پسپۆڕانی کورد بەو ئامانجە کۆبەنەوەیەك پێك ئەهێنن و چەند سعاتێك وتوێژی لەسەر ئەکەن و بە ئامانجێکیش ناگەن. کوردێکی پیر و نەخوێندەوار و دنیادیتوو کە لەو کۆبونەوەیە خزمەت ئەکا و نان وچایان بۆ ئەهێنی ئەبینی کە هەموو شەکەت بوون و چونەتە بەحری خەیالاتەوە، لەناکاو هەلدەداو ئەلێ: ئەرێ بۆچی خۆتان لەهیچ و خۆڕایی ماندووئەکەن، باب و باپیرانمان پیاوی ئازاو بەکاریان بە پێش مەرگە نێو بردووە، ئێوەش هەر ئەو نێوەی لێبنێن...))

وشە گواستنەوە لەمانایەکی کۆن بۆ مانایەکی هاوچەرخ و نویٔ کە پێویست پەیدای دەکات، پێویستییەکی پیرۆزە، زمان دەوڵەمەند دەکات و لە وشەی نارەسەن و داتـــاشراوی گەپ و ناشیرین دووری دەخـــاتەوە، یا پەنا بردنە بەر وشەی بیانی بۆ پڕکردنەوەی کەلێن و درزە نوێیەکانی رۆژگار. بەلام لەهەمان کاتیشدا دەبێتە مایەی بەدبەختی و شەرمەزاری، ئەگەر ئەو کەسانەی ئەم کارانە دەکەن لەڕووی زانیاری و ڕۆشنبیرییەوە شـــیاوی ئەم ئیشانە نەبن، پتریش ئەمە کـــاری کـــۆڕ و لیژنەی تایبەتمەندە.

هەمووومان دەزانین کە ئەدەبی فۆلکلۆر بەسەر زمانی نەوەکانی میللەتدا پشتاوپشت هاتووە و بە پێی کات و شوێن، گۆڕانکاریی بەسەرداهاتووە، لەیەك کات و شوێنیشدا بەپێی ژینگە و شێوەزاری ناوچەکە و ڕادەی ڕۆشنبیری و زیرەکیی ئەوکەسانەی کە فۆلکلۆریان لێ وەردەگیرێت، کورت کردنەوە و تێکردنەوەی لەگەڵدا کراوە، ئینجا بۆ نـــووسین بێت یا بۆ فێربـــوونی سەر زارەکی. ئەو کەسەی ئـــەرکی کـــۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری بخاتە ئەستۆی خۆی دەبیٔ بزانیٔ هەویرەکەی چەند ئاو دەکێشیٔ، دەبیٔ خۆی بۆ گەشتێکی دوور و دژوار ئامادە بکـــات، وەڕس بـــوون نەزانیٔ، هەر تێکستێکی فۆلکلۆری کەلەسەر زمانەوە دەڕژێتە سەر پەڕەی نووسین دواتر هەڵناگیرێتەوە، بۆیە دەبیٔ زۆر وشیار و وردبین و دووربین بین.

ئەدەبی ئێستامان بنـــــاغەی لەسەر ئەدەبی دوێنیٔ و پێرێمان دامـــەزراوە کە فـــۆلکلۆرە، ئەدەبی بەیانیشمان دەبێتە چەند چینە دیوارێك لەسەر دیواری ئەدەبی ئەمڕۆمان. هەر بەردێك ناوەستایەك لەم بینایەدا دایبنیٔ دەبیٔ تا چ ڕادەیەك زیان بەخۆڕاگری و جوانی ئەپارتمانەکە بگەینێت؟

پێش بڵاوکردنەوەی هەر بەرهەمێك، پێویستییەکی زۆری بەتەتڵە و بژار و بەراوردکردنی چەند جـــارەکی هەیە، دەبیٔ دەقی فـــــۆلکلۆری بە ئەمانەتێکی پیرۆز بزانین، بەبیٔ زیاد و کەم، بەڕاستی و ڕەوانی بـــــڵاوبکرێتەوە، تـــا ببێتە بەرهەمێکی مێژوویی بایەخدار، ئەو کاتە (دەستی ماندووومان لەسەر سکی تێر دەبیٔ). تا ئێرە

ڕووی قسەم لە هەموو ئەو دلسۆزانەیە کە شەونخونی دەکێشن و کات و دراو لە پێناو ئەم ئامانجە پیرۆزە دەبەخشن، بە مەبەستی بنیادنانی دواڕۆژێکی ڕووناك.

تا ئێستا بەشێکی زۆر کەم لە ئەدەبی فۆلکلۆریمان کۆکراوەتەوە، بەدەگمەنیش هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ کراوە.

کە نووسەرێك دەقێکی فۆلکلۆری بلاّودەکاتەوە، ئەگەر بزانیّ نووسینەکەی بەچاوی وردبین دەپشکنن، بە تەرازووی زێڕکێشان دەکێشرێت، تۆژینەوەی بۆ دەکرێت، کەمــوکورتی و خــەوشەکانی بە بــادەکەن، هەڵبەتە نــووسەر ناچاردەبێت بەخۆی دابچێتەوەو پتر لە نووسینەکەی دەخەفتیّ و کــۆکترو بەپێزتری دەکــات و بەرهەمی زۆروبۆریشمان زۆر نابیّ. ڕەخنە و لێکۆڵینەوە دەبنە هــۆی ڕۆشنکردنەوەی کەلێن و قوژبنی نادیار و تەم و مژاوی، دەبیّ ببێتە هۆی گەشەکردن و پیّ گەیاندن. هەڵچوون و دەمارگیری نەبیّ، کپ کردنەوەی گیانی هەوڵدان و کوژاندنەوەی چرای داهێنان نەبیّ، منیش بەپێی توانای خۆم ڕووم کردۆتە ئەم مەیدانە، تەمەنێکیشە خەریکی بەدواداچوونی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردیم، بەلاّم بەبیّ بلاّوکردنەوە، ڕوی نەبوونیو چەرخی بەدکار ڕەش بێت، هیوادارم بتوانم بەرهەمەکە بخەمە بەر دیدی خوێنەری کورد، ئــاواتە خوازیشم خـــــاوەن توانا و شارەزا و بەهرەدارەکانمان لەم بوارەدا دەستەوەستان نەوەستن، ساغ کردنەوە و ڕاستکردنەوە بەئەرکێکی پیرۆز بزانن، تا مانگ ئاوا نەبووە و تاریکە شەو دانەهاتووە، بەچاوێکی ڕەخنەگرانە بڕواننە تێکستی فۆلکلۆریی، چونکە دەقەکان بەرهەمی تاکە کەسێك و تەنیا ناوچەیەك نین، بۆیە بەتەنیا کەسێك، یان لەنــاوچەیەکدا، ئەگەر هـــەوڵی بەکـــۆمەڵی بۆ نەدرێت ئەوا ناتواندرێت سامانی پوخت کۆبکرێتەوە.

بەخوێندنەوەی سەرچاوەکان دەزانین کە سەروگوێی چەند مەتەڵی فۆلکلۆریمان شکاندوە، چەند مەتەڵ بەناوی فۆلکلۆرەوە داندراون، چەند مەتەڵیش بەناوی یەکەم جـار بلاّوکردنەوە، دووبــارە و دەبارە چاپ دەکرێنەوە. تــا ڕادەیەکیش کەم و کورتییەکانیان کــەم بکەینەوە. بۆ لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەش دەبیّ وەلاّم بۆ ئەم پرسیارانە بدۆزینەوە. مەتەڵی فۆلکلۆری چییە؟ کەی داندراوە؟ کیّ دایناوە؟ بۆ کیّ

**داندراوە؟ کـامەیان ڕاستەو کامیان ناتەواوە..؟ کە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەش ئاسان نییە، هەروەها دەبیٚ مـــەتەڵی فۆلکلۆری کوردیش بەگشتی بەهـــەموو دیالێکتەکانییەوە بێتە گـــۆڕی، دەبیٚ ئاوڕێکیش لە مـەتەڵی فـۆلکلۆری گەلانی دراوسیٚ و نـــەتەوە مـــەزنەکانی جیهان بدرێتەوە، کە لە بەرکوتەکەی ئێمە جێگەی نابێتەوە.**

## نموونەی مەتەڵی بەپێز و لێکۆڵینەوە لە دەقی چەند مەتەڵێك:

ئەم چـــەند نموونانەی خوارەوەش، ئـەگەر هــەندێك مــەتەڵی نــایاب و جۆراوجۆری‌تری ناوچە جیاجیاکانی وڵاتەکەمانی بخەینە پاڵ (بەتایبەتی گۆران و لوڕی)، دەشێن بکـــرێنە نموونەی مــەتەڵی بەپێز و لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلیان لەسەر بکرێت، وەك تـــۆمارێکی مێژوویی بیکەینەوە و زیـــرەکیو لێزانیو بیرتیژی و بـــیرکردنەوەی دانـــەرەکانیان، چـــۆنییەتی ڕێکخستن و داڕشتنیان لە بـــارەی زمان و ڕەوانبێژییەوە، هەروەها دەتوانین بـــارودۆخ و چۆنیەتیی ژیـــانی نەتەوەکەش وەك هەڵهێنانی مەتەڵەکان هەڵبێنین. ئـــەگەر لە کشتوکـــــاڵ و ئـاژەڵدارییەوە دەست پێ بکەین، دەزانین بە چ ئامرازێك و چۆن زەویی کێڵاوە، چی چاندووە،چۆنی درویتەوە، کووی کوتاوە و...، چ ئاژەڵێکی بەخێوکردووە، چۆن سوودی لێ وەرگرتووە، زۆربەی هەرە زۆری ئەم کەرستە و ئامێرانەی بەکار هێنراون و چۆنیەتیی بە کارهێنان و چاندن و بەرهەم کۆکردنەوە و گواستنەوە، بگرە تا ساغ کردنەوە و خواردنی بەرهەمەکە لە ناو مەتەڵەکاندا دەدۆزینەوە.

**نموونەکان** :-

1- ((حوشتر حایە، لە حەوایە،(بنووی گایە، هەڵسی چیایە؟) دایم دەشتە، کون لە پشتە؟))

(عومەر ئیبراهیم عەزیز، فۆلکلۆر، بەشی دووەم، ل 14) بەشێکی کەمە (حوشتر حایە، لە حەوایە – گەنمی دەشتێ، کون لە پشتێ)).(صدرالدین خۆشناو، کاروان، ژ 48 ساڵی 1986، ل 111.

((بنوی گایە، هەڵسی چیایە؟)) (محمد کریم شـــریف، فـــــۆلکلۆری یارییەکانی کوردەواری، 1977، ل 179).

زۆرینەی کورد لە پێشا کۆچەر و دەوار نشین بووە. ڕەشماڵ بە ئەستووندەکە و بە ڕست و داو لە حەوا ڕادەگیرێت. تاوڵ بەهەڵدراوی قەوارەی گەورەیە و شێوەکەی لە چیا دەکات. کە دەیخەن و دەیپێچنەوە، ڕەنگ و قەبارەکەی لە گاڕەشێك دەچێت کە

خەوتبێت. مەڕدار و ڕەوەند و چۆڵپەرستەكان لە دەشت و دەر، لە هەواری، لە بناری چیاكان، لە كوێستانان، لە نزیك پاوان و لەوەڕگەی پەزەكانیانەوە ڕەشماڵ هەڵدەدەن. بۆ گیركردنی ئەستوندەكە و ڕاگرتنیشی، چەند كونێكی تێدایە كە هەڵدرا دەكەونە سەرپشتی.

2-((قوون لەسەر حەردی، سەر لەبن قوونیٚ، دە لە دووان، دەست لە ملان؟)). (عەزە كوردەی سەرگەڕان، هەولێر)

((قوین ل ئاخێ، سەر ل قوینێ ، دەه ل دووا؟))(ئەحمەد زەرو، نوسەری كورد، ژ8، ل19

((سەر ل قوین، قوین لە ئەرد، دەهـ ل دوو؟)) (ئەحمەد قەرەنی،كانی، 984، ل143)

((دەهـ پێیە، سیٚ سەرییە، دوو دەستە، یەك پەرییە؟)).

(قەناتی كوردۆ، كۆمەڵە تێكستی فۆلكلۆری كوردی، 976 ، ل270).

هونەرمەندێك، نیگاركێشێك، تـــابلۆی مەڕ دۆشین و بێركــــردنی كێشاوە، بێری لەسەر زەوی دانیشتووە سەری بردۆتە ژێر دونگی مەڕێك بە دە پەنجەی ناسكی هەردوو دەستی، شیر لە دوو گوانی مەڕەكە دەدۆشیٚ، كاكەی شوان، زیتە و كارامە لەسەر سەربێر (بەردەبێر)یٚ دانیشتووە، دەستی خستۆتە سەر ملی مەڕەكە، تا بێری دەڵیٚ ((بەرەكەت)). یان پەرییەك، خاتونێكی نەشمیل بەدەنگە بەسۆزەكەی خۆی چێڵێك دەلاوێنێتەوە و دەیدۆشیٚ، مانگاكەش بەسۆزی دایكایەتی وردە وردە گوێرەكەكەی دەلێسێتەوە. كە بەهەرسێكیان دەپیٚ و سیٚ سەرو دوو دەستیان هەیە!

3- ((شتێك هەیە لە چیایە، سپیاتی سپیانی تێدایە، ناوی گێزەر گیایە، جەرگم بووە كـــون كـــون، كوندەڵانم بێننە كن؟))، (عەیشیٚ و عەزە كوردەی باوكی- گوندی سەرگەڕان- دیبەگە- هەولێر).

لە كوێستانان، لە هەوار و ڕەشماڵان، كابانی مەڕ داران، ژاژی و پەنیر لە شیری (سپیاتی) مەڕ (سپیان) و جۆرە گیایەكی سروشتی چیاكان (بیزا) دروست دەكەن،

ئەو کەسەی ژاژی بخوات زۆری تێنوو دەبێت و حەز دەکات ئاوی ساردی کوندەی سەر کوندەلانی لەتەنیشت دابندرێت.

سپیاتی:- درکەیە بۆ شیر و بەربوومی شیر. سپیان:- درکەیە بۆ مەڕ. (سپیاتی، سپیانی) و (چیایە، گیایە) ڕەگەز دۆزی ناتەواویان تێدایە.

لە دەقەکەدا پێمان دەڵێ شتەکە لە چیایە، دواتر روونکردنەوە و ئاسانکاریمان بۆ دەکا ودەڵێ شیری مەڕ و گیایەکی تێدایە، بەوەش ناوەستێ بەڵکو پتر ڕێنماییمان دەکا و دەڵێ ئەوی بیخوا زۆری تێنوو دەبێ و حەزی دەچێتە ئاوی سارد، لە هەمان کاتدا تایبەتمەندییەکی تێدایە کە ئەم سیفەتانە تەنها لە ژاژی و پەنیردا کۆدەبنەوە.

دەوار و بێرکردن و پەنیرو ژاژی دروست کردنمان بەیەکەوە گرێدا و کردماننە سێ نموونەی ئاژەڵداری. دوو نمونەش بۆ زەوی کێلان و جۆخین کوتان دێنین:

4- ((شەش چاو و شەش گوێیە، سێ سەر و دە پێیە، چواری چاوە،دار لەناوە، دە شاقاوە(دە هەنگاوە)،گڵ درەی ناوە،ناوی دارە، کلکی خوارە؟))

(زێنەبی هاوسەری مەلا ئەحمەدی خەنجەرگەورە- قوڵتەپە- هەولێر).

((چواری چاوە..هەشتی هەنگاوە.. بۆ درەی ناوە؟))(سەردار فەتاح، خەرمانێك،ل16

دەقی مەتەڵەکە جوتیارێك و جووتە وڵاخەکەی بەیەکەوە کۆدەکاتەوە کە شەش چاو و شەش گوێ و سێ سەر و دە پێیان هـــەیە. نیرێك لەسەر ملی وڵاخەکان قایم کراوە، کە چوار کونی (چاوی) تێدایە، هەر کونێکیش دارکلاوەیەکی لەناو دایە. ئامور (هەوجاڕ) بەهۆی مژانە و زەنگوڵە و سەر مژانکە و هیرتەوە لە نیرەکە قایم کراوە. بەهۆی گاسنێك کە بەزمانەی هـــەوجاڕەکەوە بەستراوە، زەوی دەکێڵێ و گڵ هەڵدەدڕێت.

5-((چواری گوێیە، هەشی پێیە، بووك ڕەوێیە، (دەری دارە، پڕ بزمارە، لەناویدا گورگە هارە)؟)). (فاتح محمد داربەنی)، (عمر ابراهیم، فۆلکلۆر- بەشی دووەم، ل 6. بەلام برگەی دوایی نەنووسراوە).

دوو ولاّغ، کـە چـوار گویٚ و هەشت پێیان هـــەیە، جەنجەڕێك لەسەر خەرمان ڕادەکێشن، جـــەنجەڕەکە لە دار دروست کـــراوە، بـــەمێخی ســـەرزل بـــزماڕڕێژکراوە، دوو تۆپی جەنجەڕی لەنـــاو دایە و دەخولێتەوە، دەمەبیور و چـــەقۆی تیژ (باڵتە)و هار و ترسناکیان لیٚ چەسپ کراوە، بۆ کوتانی (ورد کردنی) قرشە (قەد و گەڵا و گوڵی گەنمی دروواوە) بەکاردەهێنرێت، تـــا بیکاتە وردە (کـــــا و دان) و شـــــەن بکرێت و دانەکەی لیٚ جیابکرێتەوە.

((ئەم لای دار و ئەو لای دار، تیایەتی دوو سەگی هار))(سەردار فەتاح، خەرمانێك،ل14).

6- ((چاندم نۆك، شین بوو بی، پەلك پانی بەرهەرمی؟)).

((بەپەل بی، بەگەڵاتوو، بەبەرهەمی؟)) ( سەردار، خەرمانێك...، ل28)

((هەپلە پان و هەپلەپان، گیاییٚ شینە، پەلکی پان، کوڕی پیرە، بابیٚ جان؟)) (ئەحمەد قەرەنی، کانی ، ل147). ((بێدەرا (جۆخینا) ل پشتا بانی، کا چێترە ژدانی؟)) (پێزانی ئالیخانی،دوو مراری...، ل41). ( ئەحمەد زەرو، مامکێن..، ل 56).

لە دەقەکەدا لیکچواندنی بە هێز و کورتبڕی تەواو بەدی دەکرێن، تۆوی پەمۆ تاڕادەیەك بەدنکە نۆك دەچیٚ، ڕەنگی سەوز و شینی ڕووەکەکەی لە (داری بی) دەکا، گەڵاکانی پانن، لە شێوە و قـــەوارەدا وەکو گەڵای داری تـــووە، قۆزاخەکەی پێش پشکووتن وەك بـــەری هەرمێیە، داوی لـــۆکە (ڕیشی سپیی‌یە = پیرە) سپی‌یە، داوی پەمۆ (کا) بەنرخترە لە تۆی پەمۆ (پەموانە) کە دانەکەیەتی.

7-((شیرینە لەدار ڕنە، دار ڕنە لە گـــــویٚ بەلە، گویٚ بـــەلە بەڕیٚ کەوی، پیٚپانۆك بە دووکەوی؟)) ( پلکە زەینەب- قوڵتەپە - هەولێر).

((شیرنۆك ل دارینۆك، دارینۆك ل گوهبەلۆك، گوهبەلۆك ب ڕیٚ کەت، پیٚ پەحنوك ب دیف کەت؟)).(ئەحمەد زەرۆ،نووسەری کورد، ژ 8، 1982، ل 21)

((شیرینی شاری، هنگڤینی داری، گوهبەڵ ب ڕێدا پێ (پالەی!) ب دیڤدا؟))
(ئەحمەد زەرۆ،مامکێن کوردی...، ل32)

میوە، بەری داری بەردار کە پێدەگات، کە پەسیرە شیرین دەبێ دەبێتە هەنگوین، تـــرێ لە دارمێو دەڕندرێ، لەو سەردەمەیدا تـــــــــرێ و میـوەی دیکەش دەکرایە ناو قەرتاڵە و سەوی لە شۆڵی دار دروست کراو، لە وڵاخی گوێ بەل (بەل:- ڕەپ و لول وەستاو، مەبەست کەر و هێسترە) باردەکرا، وڵاخەکە بە بارەوە بەڕێ دەکەوت، کاروانچی پێ پان (مرۆڤ) دەست دەداتە داردەستەکەی و دەکەوێتە دوای.(مەتەڵی ژمارە (2) وە (7) یەکیەتیی فۆلکلۆری ناوچە جیاجیاکانی گەلەکەمان دەنوێنن).

8-((ئاڵدم باڵدم، شەش پێی دووسم، ئەگەر نەیـــزانی، پۆپیتەت دەگـــرم، پێت دا دەفسم؟)). (عەلی مەلا تاهیر بەکر، هەولێر - 1986).
((هەشتم هەشتم، شەش پای دووسم، ئەگەر هەڵی نەدەی دەدەمت تسم؟)). (بڕەك ئەیوبیان، هەتەڵەی کوردی ، ل23)
((شەش بەندو بەندیلکەك،دو نان (دارەك و دوو دەول) و کوتلکەك؟))
(پێزانی ئالیخانی، دوو مراری...ل 16 ،بەڵام(دارەك و دوو دەول) لەوێ نەنووسراوە).

تەرازووی دەسکـــردی کـــــــــوردەواری کە ترێ و میوەی دیکەیان پێ دەکڕی و دەفرۆشت (ترێیان سەربەسەر یا یەك بەدوو بە گەنم دەگۆڕییەوە) بـەم شێوەیەی خوارەوە دروست دەکـــــرا:- دارێکی ڕێك و ڕاست، لە نــاوەڕاستەوە بەنێکی پێوە دەبەسترا یـا تێی هەڵدەکێشرا، لە کـــــاتی کێشکردن دا داوەکەی ناوڕاستی دارەکە (پۆپیتە)، بەدەست دەگیرا شەش داوی یەکسان لە درێژیدا (شەش پا)، هەر سەرەی دارەکە سێ داوی پێوە دەبەسترا ونــــزیکەی 50 سم شـــۆڕ دەبووەنەوە، دوو دەفری یەکسان لە قەوارە و کێشدا (دوو سم)، ڕۆخی هەریەکێکیان لە سێ شوێنی یەکسان لەیەك دوور کون دەکراو یا سێ ئەڵقەی هەبوو، سێ داوەکەی پێوە دەبەسترا.

9- ((ئـەمڕۆ چـوومە دەشـتێ، دەعبایـەکم گەیـشتێ، قـوز لـەبن کلکـی، گـون لەسـەر پشتێ؟)) (پیاوێك سواری ماین بووە)

((تشتەکی چیت لدەشتێ، قینکا لبنکلکێ، یەکا لهێسکی پشتێ، چوار پێ ئی لبن زگی، دوو ژێ لتەنیشتێ ؟))

وەڵامەکەی: راوچییەك، پیاوێك سواری ماینێکە. دووپای سوارەکە لە تەنیشتی ماینەکەیە و چوار پای ماینەکەش لەسەر زەوییە.

10-((ئەز چوومە دەشتا گەڤەرە، من تەیرەك دیت ب شاش و پەڕە، دارا حشکە فێقیێ تەرە؟)) ئەحمەد قەرەنی ، کانی...، ل137.

مێش هەنگوین مێرووێکی بـــاڵدارە. سەبەتە (قەرتاڵە =حەلە)ی بەخێوکردنی هەنگ لە شوولی داری تەڕ دروست دەکرێت، دوایی وشك دەبێتەوە، هەندێك جاریش هەنگ لەناو کۆلکەداری کلۆردا شانەی دادەنێت، شـــانەی هەنگ مێوێکی وشکە، هەنگوینەکەی ناوی تەڕە.

((گەلەم ڕانی،پەچەم دۆشی؟))(محمدی مەلا کریم، ڕۆژی کوردستان، ژمارە 63،ل40).

((مەڕ چوو هەوێزم دۆشت؟)) (صدرالدین خۆشناو،کاروان ژ 48 ، ل113).

لە کاتی هەنگوین بڕینەوەدا هەنگەکان لە شانەکانیان(هەوێز=پەچە) دوکەڵدەدرێن و دەردەکرێنە دەرەوە و شانەکەیان (شوێنەکەیان) کە هەنگوینی تێدایە دەدۆشرێت.

11-((ئەمە چییە لەم شـــــــارە، ددان دارە وەك مشـــارە، هەردوو دیوی بەکارە، ئەفرۆشێ بە پارە؟)) (شانە)

((مامەکم هەیە لە بێری، گۆلکۆکان دادەگێڕی)) (شانە و ئەسپێ گرتن)

وەك دەزانین تا بەرەبەری ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، مووی سەری منداڵی نێرینە و هی پیاوان وەك گندۆرەی سپیکراو بە مووس و گویزان پاك دەتراشرا، بە دەگمەن پیاو هەبوو قژی درێژبێت، مەگەر دەروێش وسۆفی ومەکتەبلی و...بووبێت، بەڵام بڕینی پرچی ئافرەت سووکایەتی و ئەتکردن بوو، هەڵبەتە بە هۆی کەمی سابوون و کەم

خۆشۆردن و زۆر دژونی، چڵکن و قڕێژدار دەبوون وسەریان پڕدەبوو لە ئەسپێ و بانگولە و ڕشك، لەو ســـــەردەمەدا دۆم کە پیشەوەری گــەڕۆك بوون، بەزۆری وردەواڵەی وەك تەشی و تیرۆگ و شانە و بێژینگ و داس و تەپشوو و شتیدیکەیان دروست دەکرد، شانەی ژنانیان لە دار دەکرد و لە دیهات و شارەکاندا دەیانفرۆشت (لە شارە گەورەکانیشا پیشەوەری وەك: دارتــاش و ئاسنگەر ، ئەم کارانەیان دەکرد)، شانەکە پــان و تــەنك و دوو ڕووی هــەبوو. دیوێکی شانەکە ددانەکانی شاشبوون پێیان دەگووت دیوی درشتان، دیوەکەی دیکەشی هوردان بوو، بۆ ئەسپێ دەرکردن لە سەریانا، هــەندێك داوە دەزووییان لە ددانەی دیوە وردانەکە دەئــاڵاند و قژیان پێدادەینا، جلکەکانیشیان لە نــاو ئاودا دەکوڵاند تــا ئەسپێکان بتۆپن. دواتــریش دەرمان ئەسپێ (مێرووکوژ) بڵاوبۆوە و زۆربونی سابوون و خۆ شۆرین پاکوخاوێنی وزانینی رۆڵی ترسناکی کێچ و ئەسپێ و مێشوولە لە بڵاوبونەوەی پەتا و تیفۆس و تاولەرز ئەم مێرووە زیانبەخشانەی لەبەر چاوان گومکردن یا زۆر کەمتر بووینەوە.

12- (( دارەبەنێ، لەسەر بەنێ، میرو حاکم دەست دەکەنێ؟)).

((دارە بەنێ لەقەد کەنێ، شێخ و مەلا دەستی ئەدەنێ؟))، ( محمدی مەلا کریم، ڕۆژی کوردستان، ژ63، ل 38) ،

ئەگەر بە وردی سەرنجێکی ئەم مەتەڵە بچکۆلەیە بدەین زۆر شتی گەورەمان بۆ دەخوێندرێتەوە. بەدەســکاری کردنی هەر پیتێك یا وشەیەك زۆر شــــتمان لەدەست دەچێت و بۆمان نادۆزرێتەوە، دارە بەن، سەر بەن، (بان، زەوی پان و بەرز، بانی چیا، قەدکەن) ، مــیر و حـــــاکم و شێخ و مــــەلا، دەست دەکەنــێ (دەست دەدەنێ) چەند وشەیەکی کەمن، شتی زۆریان لەنــاودا حـــــەشاردراوە، جگە لەوەی کە بەزمانێکی پاراو و ئاوازێکی شیرین هەلبەستراوە.

دارەبەن: (دار بنێشت، دار قــەزوان) دارێکە لە قــەدپاڵ و ســـەربەن و تەلانی هەندێك ناوچەی وڵات دا بەسروشتی دەڕوێت، دانیشتوانی مەڵبەندەکەش بەکــۆکردنەوەی بنێشتە تاڵ و قەزوان ڕنین لەدارەبەن، مازوو گروان لە دار مازوو( وەك دەڵێن :

((هەلاران و مەلاران، هێلکەی ئەکا لە داران، بۆ فەقیر و هەژاران؟)) وەڵام مازوو) و بەڕوو و جــەفت لە دار بەڕوو و کرۆسك (هەرمێ کیویلکە) و گوێژ (گێوژ) کۆکردنەوە بۆ خواردن و سوود لێ وەرگرتنیان یا پێویستیەکانی ژیانی ساکار و سادەیی خۆیان پێ دابین دەکرد، بەتایبەتی ئەو هەژار و ڕەشوڕووتانەی کە خاوەن موڵك و مــاڵات نەبــوون و دەرفەتی کارکردن کەم بووە. بەڵام چیاو دارەبەن و دار مازوو و کەنگرۆك... هتد، موڵکی گشتی بووین و بۆ هەمووان بێ پەنگانەوە بووە. دیارە دەست کردنە دارەبەن بۆ جاجگە تــاڵ و کەسکوان کۆکردنەوەی بۆ میر و حاکم و شێخ و مەلایان ناشێ و لەوانیش ناوەشێتەوە، بەڵکو کاری چینی ڕەنجدەر و ڕەشوڕووتە، کە دەبێ بۆخۆیان و بۆ میرو حاکم و شێخ و مەلا و براگەوران کۆی بکەنەوە و ئەرکی دەستەبەر کردنی پێداویستییەکانی ژیانی خــۆیان و ئــەوانیان لە ئەستۆدا بــووە. لێرەدا سەرسوڕمانێك هەیە، چۆن دەبێ مەلاو شێخ دەست بدەنە دارەبەن!. بۆیە بیر لە دارە بەنێکی دی دەکرێتەوە کە بنێشت دەربدات و لە سەربەن بێت، ئــەویش لــــــووتە، بەقەد کێوی سەرەوەیە و چڵم دەردەدات و هەر کەسەش دەبێت کەپووی خۆی بسڕێت و چڵمەکەی لێ بکاتەوە.

هەر دەربارەی نواندنی جیاوازی نێوان چینەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری سەیری دەقێکی دیکەی بچووك و بەڕواڵەت ناشیرین دەکەین کە دەڵێ:

((ئەوە چییە دەوڵەمەند هەری(هەڵی) دەگرن و فەقیر فڕێی دەدەن؟)) (چڵم)

زۆرینەی کرمانج و جوتیار و ســـەپان و شـــوان و گـــاوان و بەرخەوان و کاسبکاری کوردی هەژار لە دەر و دەشت کاریان کردووە و لە هەر شوێنێك لەم سروشتە پان و بەرینەی دەوروبەریاندا چڵمی لوتیان هاتبێ، ئەوا فننێکیان کردووە و فڕێیان داوە، بەڵام میر و ئاغا و بەگ و شێخ و مەلاّ و پیاوی ماقوڵی دیکە، لە دیوەخان و مزگەوت و ژێــر دەوار و ... دانیشتوون، ناکــرێ بە چڵمەکیان رایەخ و مــافوور و ژووری کۆڕو دانیشتنیان پیس بکەن، بۆیە چڵمیان دەکردە نێو دەسەسڕێك و لە بەرك و بەر

باخه‌ڵیان هه‌ڵیانده‌گرت، تا دواتر له ماڵه‌وه بۆیان ده‌شووشتن.... له پـــــه‌نده‌كانی پیره‌مێردی نه‌مر دا هاتووه :-

((گه‌دا كه چڵم به قۆڵ ئه‌سڕیٚ ---- سه‌ركه‌وت؟؟ كلكی گا به مه‌ندێل ئه‌گریٚ[57]))

13- ((بلـــــوورین گومـه‌زێكم دی، مــــه‌هو ڕۆژی له نێوابوو، كه ڕۆژ هه‌ڵـــیٚ له گومه‌زدا، بلوورین شووشه ئه‌شكێنیٚ، ئه‌گه‌ر مه‌ردی مه‌ته‌ڵ زانی، به‌فیكری خۆت هه‌ڵی بێنه، موعه‌ممایه‌كی هێند سه‌هله، كه ته‌یرێكه‌ش هه‌ڵی دێنیٚ؟)). كامه‌ران موكری، فۆلكلۆر- هه‌ولێر.

هێلكه گومه‌زێكی سپی و خر و سه‌یره، سپیلك و زه‌ردێنی ناو هێلكه‌كه به‌مانگ و ڕۆژ ده‌چن، كه ناوه‌رۆكی هێلكه‌كه ده‌بێته جووجه‌ڵه، جووچكه‌كه به دندووكی بله‌وری شووشه‌ی توێكڵی هێلكه‌كه ده‌شكێنیٚ، مه‌ته‌ڵه‌كه هه‌ڵبێنه ئاسانه، هێلكه‌یه، هێلكه‌ش ته‌یرۆكه (باڵنده‌ی بچووك) له‌سه‌ری كورك (كڕ) ده‌بیٚ و ده‌یكاته جووجه‌ڵه و هه‌ڵیدێنیٚ.

زیره‌كایه‌تی و بیرتیژی و ڕه‌وانبێژی تا چ ڕاده‌یه‌ك بڕی كردووه!.

لێكچواندنی نایاب و به‌هێزی تێدایه، هه‌ڵهێنان وه‌ك ڕه‌گه‌ز دۆزی ته‌واو بۆ دوو مه‌به‌ستی له‌یه‌كدی دوور به‌كار هاتووه، یه‌كێكیان (مه‌به‌سته قووڵه‌كه‌یان) هه‌ڵهێنانی مه‌ته‌ڵه‌كه‌یه، ئه‌وی دیكه‌ش (مه‌به‌ستی به‌رچاو) هه‌ڵهێنانی هێلكه‌یه به‌ڵام ده‌سخه‌رۆدان و شێواندنیشی تێدایه، چونكه كه جـاری دووه‌م درێـــژبڕی ده‌داتیٚ و پتر روونی ده‌كاته‌وه دیسان پتر سه‌ر له بیسته‌ر ده‌شێوێنیٚ و ده‌ڵیٚ ((مه‌ته‌ڵۆكه‌كی هێنده ئاسانه كه ته‌یرۆكه‌ش هه‌ڵیدێنیٚ)) بۆیه بیسته‌ری ته‌فره‌دراو واده‌زانیٚ مه‌ته‌ڵه‌كه ئه‌وه‌نده ئاسانه كه ته‌یرۆكه هه‌ڵی دێنیٚ، به‌ڵام مه‌ته‌ڵهێن به پێچه‌وانه‌وه له جاری دووه‌مدا بیٚفرتوفێڵ و به ئـــاشكرا هاوار ده‌كا و پێی ده‌ڵیٚ: تـه‌یرۆكه هــــه‌ڵیدێنیٚ، به‌مه‌ش تایبه‌تمه‌ندییه‌كه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه ته‌واو ده‌كات ئه‌ویش ئه‌وه‌یه كه

57- په‌نده‌كانی پیره‌مێرد، ب 4 ،1980، ل 155 .

تەیرۆکە تەنها و تەنها دەتوانێت هێلکە هەڵبێنیٚ وبیکاتە جووجەڵە و ناتوانیٚ هیچ شتێکی دیکە هەڵبێنێت.

14- ((دارێك هەیە لەناو ئاویٚ (داریٚ گوڵباویٚ)، پێنج لکان داویٚ، سیٚ لە سێبەریٚ و دوو لەبەر تاویٚ؟))

((دارەکا ل هنداڤ ئاڤیٚ، پێنج (5) چـەق ژیٚ دەبلاڤن، سـیٚ لبەر سیبەریٚ، دوو لبەر هەتاڤیٚ ؟)) (ئەحمەد زەرۆ، مامکێن...، ل44).

(( پێنجن حەفت و هەشتی پیٚ ناویٚ، نۆ لە سێبەریٚ، هەشت لەبەر تاویٚ ؟)) (ستار عەباس ڕەزا، هەولێر). لە ڕۆژێکدا پێنج نوێژ هەیە،دەسنوێژی بە ئاو بۆ هەڵدەگیرێت، سیٚ نـوێژ لە سێبەرە (ڕۆژ بـەدەرەوە نیە) نـــــۆڕکات (رکاعات)ە، کاتیٚ دوو نوێژەکەی دیکەش (هەشت ڕکاتە)کە، ڕۆژ بەدەرەوەیە.

15-((ئەستێرەی جەدی لە ئاسمانە، کاوڕە مێیە، دایکی بەرانە؟)) (سلیمان قادر بەرزەواوری- هەولێر). چۆن بەران کە نێرە دەزێت و بەرخی مێی لیٚ دەبێت...؟

((لێرەڕا هەتا مازندەران، بپرسن لە عەقڵ بەسەران، بەرخی میٚ دایکی بەران؟)). (بڕەك ئەیوبیان، هەتەڵەی...، ل20). دایکە حەوا (بەرخی میٚ) لە پەراسوی باوکە ئادەمەوە (بەران) دروست کراوە، گونجاندنی دوو شتی دژ بە یەك، لە بیرو باوەڕ و ئایندا... لە مەتەڵێکی بچووکدا بەدی دەکرێت.

16-((سواری کەس نەتەراندوو (نەبەزاندی)، لانکی کەس ڕانەژاندوو (نەهەژاندی)، باخی کەس نەچەقاندوو (نەچەقاندی)؟)).

(ئۆرخانی غالب، چەند باسێکی ئەدەبی، ل26) بەلاٌم سواری کەس (نەبەزاندی) بووە بە سواری کەس (نەتەراندوو) وەلاٌمەکەشی لە مردنەوە بووە بە (با).هەروەها ((مەرگی کەس نەچڵاند، لانکی کەس ڕانەژاند)بە ئاسمان و بـــا داندراون لە لایەن (بـڕەك ئەیوبیان، هەتەڵەی...، ل21).

ئەم مەتەڵە مەتەڵێکی فەلسەفی زۆر بەرزە: هیچ کەسێك مردن یا عیزرائیل نابەزێنێت و لە دەستی دەرباز نابێ، گۆڕ لە شێوەی لانك دایە، چۆن منداڵ لەناو بێشکە درێژ دەکرێت و دەخەوێت ئەوهاش مردوو لە ناو گۆڕەکە درێژ دەکرێت، بەڵام هیچ دایکێك ناتوانێت گۆڕی کۆرپە مردووەکەی ڕابژەنێت. پاش مردن و زیندوو کردنەوە مرۆڤی خواناس و کردەوە باش بە بەهەشت شاد دەبێت، دارەکانی میوەجاتی باخی بەهەشت، بەدەستی کەس نەچێندراون.

17- ((مامریەك، هێلکە دووازدە، جوجەڵە سێصەد و پەنجا و پانزە؟))
(محمدی مەلا کریم، ڕۆژی کوردستان، ژ63 ، ل 41).
((سێسەد و شێست و شەش چویچك، دووازدە هێك و ئێك مریشك؟)).
( پێزانی ئالیخانی،دوو مراری...ل40) لەگەڵ کەمێك گۆڕان لە عبدالباقی فارس فارس، ئۆردوگای قوشتەپە) وەرگیراوە. ساڵێك (12) مانگ و (365) ڕۆژە.

18- ((چیە هەرتم ل ماڵە، گەه شەکرە، گەه تاڵە؟))
(کوردۆییڤ، کۆمەڵە تێکستی...، ل269
((ژ ژەهرێ تاڵترە، ژهنگڤینی شیرینترە؟)) ( ئەحمەد قەرەنی، کانی...، ل142).
(( ئەم لای دیوار ، ئەولای دیوار ، ناوەراستەکەی سەگێکی هار؟))
محمدی مەلا کریم ، رۆژی کوردستان، ژ 63، ل 35)

زمان هەموو کاتێك لەناو دەم دایە، ئەگەر بەچاکە گەڕا، قسەی شیرین و خۆش و بەسوودیکرد، ئەوا لەشەکر و هەنگوین شیرینترە، ئەگەر ئارداوێژیشی ئازاردان و هەست بریندارکردن و کووکە نانەوە بێت، ئەوا لە ژەهر تاڵترە و لە خەنجەری دەبانی ژەهراویش کوشندەترە.

19- ((وی لای پەرژان، وی لای پەرژان، ل نیڤەکێ(ناڤدا) مۆری و مەرجان؟)).
(ئەحمەد زەرۆ ، نووسەری کورد، ژ 8 ، ل14) .

((ئەم لای پەرژین، ئەو لای پەرژین، تیایەتی (ناوەڕاستەکەی) کۆترێکی نەخشین؟)) (گۆڤاری پەروەردەو زانست ژ (1) ساڵی (1) ل96.)، ( سەردار فەتاح، خەرمانێك..، ل12).( محمدی مەلا کریم، ڕۆژی کوردستان، ژ63،ل 35 )

برژانگ وەك پەرژین وەستاوە و چوار دەوری چاوی داوە و دەیپارێزێ، چاو وەك کۆتری نەخشین (شین و سپی، ڕەش و سپی، چاوبەڵەك)ە. وەك مۆری‌و مەرجان خڕ و بریسکە دارە.

20-((بن یێ شینە، سەریێ سپییە، کولاڤ زێرینە؟)) (ئەحمەد زەرۆ، مامکێن، ل56)

گەڵاو نێرکی ڕووەکی نێرگـــز. سەوزێکی شینباوە، پـــەڕی گوڵەکەی سپییە و ناوەندی گوڵەکە، کڵاوەیەکی ڕەنگ زەردی تێدایە کە بەکڵاوی کوردەواری دەچێت. نێرگز گوڵێکی جـــوان و بۆن خۆش و ســـەرنج ڕاکێشی ســـــروشتی کوردستانە، لە بەهاراندا نێرگزجاڕەکان پەلکێشی هەست و هۆشی مـــرۆ دەکەن. کورد دەوروبەر و سروشت و ژیانی خۆی بەپێی بۆچونی کاتی و شوێنی خۆی بەفۆلکلۆر تۆمار کردووە.

21- ((بیی تەڕەتاڵە، لێو تەڕەدوونە؟)) ملا خالد ابوبکر احمد- هەولێر.

((لێو تەڕە دوونە، بی تەڕ شینە!)) ( سەعدوڵا شێخانی ،گوڵبژێرێك..، ل78)

((بیی تەڕ تاڵە!)). ( عەلائەدین سجادی ، دەقەکانی ئەدەبی کوردی...، ل167)

تامی شوولی دار (بی) تەڕ تاڵە، مرۆڤیش دوو لێوی تەڕی هەیە. وەڵامی مەتەڵەکە لە تێکستەکەی دایە، بەڵام بە خێرایی دەگوترێت تا بیستەرەکەی چەواشە ببێت.

22- ((گۆشتی سەگی گڕوو (گەڕ) دەخوریٚ!))

پێستەی سەگی گەڕ خورشتی هەیە! ڕستەیەکی خەبەری تەواوە و پرسیار نییە! وەڵامەکە لە دەقەکە دایە، بەڵام گوێگری سادە تەفرە دەداو بەهەڵەی دەبا.لە مێشکی‌دا پرسیارێك دروست دەبیٚ و لەجیاتی (دەخوریٚ) بە مانای خورشت بزانیٚ، ئەو سەری سووڕدەمێنێت کە چۆن دەکریٚ گۆشتی سەگی گەڕ وەك خۆراك بخورێت، لە کاتێکا سەگی ساغ گڵاوەو گۆشتەکەی ناخورێت،

هەر لە بابەتی تەفرەدانەوە زۆر جار دەقی مەتەڵ سیفەتی گیانلەبەران دەداتە پاڵ شتی بێگیان و نازیندوو، بۆ نموونە:- ((رەشی رەشەندوو دەچێتە کونەکی بە موو، دێتەدەرێ ئاو لەدوو؟)) وەڵام :(کلچووك و چاو و فرمێسك)، جووڵانەوە و چوونەژوور وهاتنەدەر سیفەتی گیانلەبەر و شتی زیندووە و دراوەتە پـــاڵ (کلچووك = قەڵەمی رەشکردنی چاوی ژنان). مەتەڵی لەم بابەتە گەلێك زۆرن وەك: ((مردوو زیندوو رادەکێشێت؟)) وەڵام (پێشاو)، کەچی لە راستیدا بە پێچەوانەیە و دەبێ زیندوو مردوو رایکێشێت.

23- ((منداڵێك بـــانگی منداڵێکی دیکە دەکـات و دەڵـــێ: ((هۆ هۆ... خاڵە! ئەتو خاڵی منی، ئەمنیش مامی تۆمە، باوکی من باپیری تۆیە! ئەم خزمایەتی‌یە چۆن دەشێ ؟)) (هەمین احمد عبدالرحمن)

وەڵام: کوڕ و باوکێك، دایکێکی بێوەژن و کیژەکەی مارە دەکەن، دایکەکە بۆ کوڕەکە، کچی بێوەژنەکەش لەبـــاوکی کوڕەکە مـــارەدەکرێت. هەریەکە و کوڕێکیان دەبێت، کوڕی (بێوەژن و کوڕەکە) ،بانگی کوڕی (باوکە و کچەکە) دەکات.

24- (( دە هۆقە ڕۆن (یا دەڵێن دۆشاو) لەناو هیزەیەك دایە کە قەبارەکەی (10) دە هۆقە روون یا دۆشاو دەگرێت، دوو دەفــری دیکەش لە بەر دەستدان کە یە کێکیان پێنج هـۆقە و ئەوی دیکەشیان ســێ هــۆقــە دەگرێت، روونەکە بکە بە دوو بەشی وەك یەك! (5 هۆقە+ 5 هۆقە ) بەمەرجێك هـیچ تەرازوو و دەفــری دیکەشمان لانییە جگە لە (3) سێ دەفرەکەی کە لە پێشەوە ناومان هێنان))؟

بۆ وەڵامەکەی بڕوانە مەتەڵی تایبەت بە بیرکاری ، ل 236

## نموونەی دەوڵەمەندی کورد لە مەتەڵدا

ئەگەر بڕوانینە ئەو مەتەڵانەی کە بۆ: هێلکە، کەلەشێر، کیسەڵ، رەشماڵ، سەماوەر، مقەس، باگوردان، مەشکە و مەڕدۆشین، ئاش، نانکردن، چاوی مرۆ، ئاسمان و مانگ، خۆر و ئەستێرەکان.... ئەوا بە زەقی بۆمان دەردەکەوێت کە کورد لە مەتەڵی فۆلکلۆریدا تابڵێی پتر هەبووە و دەوڵەمەندە. ئەم چەند مەتەڵەی خوارەوە، کەتەنها بۆ هێلکە گوتراون، دەکەینە بەڵگەی بۆچوونەکانمان

1- ((سایەقەی سامالْ هەوری فەڕەنگی، دوو ئاو لە جامێ هەریەك لە ڕەنگێ؟))
(سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە (1961) نەقابەی مامۆستایان، ل25).
(محمدی مەلا کەریم، ڕۆژی کوردستان ژمارە 63 ساڵی1981، ل39). (د.عزالدین مستەفا رەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ( 1979)، چ2، ل 212)
(فخرالدین رؤوف،چەپکێك لە مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی ، سلێمانی، 1978 ، ل 38).
(جەمال بابان،گۆڤاری پەروەردە و زانست، ژمارە 1،ساڵی1961)
((هەلاڵەی ئاسمان، هەوری فەرەنگێ، دوو ئاو لە جامێ هەریەك لە ڕەنگێ؟)). بڕەك ئەیوبیان ، هەتەڵەی کوردی، ل23.

2- ((جامێ (بادیێ) تەنگ، ئاوی دوو ڕەنگ؟)) سەباح ئەسعد خۆشناو.
((پیاڵەی سپی، ئاوی دوو ڕەنگ؟))
((کاشی چینی ئاوی دوو ڕەنگ؟)) (بڕەك ئەیوبیان (1982) هەتەڵەی کوردی، ل17.)
((گۆزیکمان هەیە سپی ڕەنگ، تێی دایە ئاوی دوو ڕەنگ؟))
بڕەك ئەیوبیان، هەتەڵەی کوردی،ئێران،1982 ، ل18.
((دەریای دوو ڕەنگ، بێ شەپۆل و جەنگ؟)) بڕەك ئەیوبیان، هەتەڵەی کوردی،ل13

3-((سێنی و فەخفـــووری، ئـــاوی دوو ڕەنگە، بە ساردی شـلە بە گـەرمی تـوندە (تونگە)؟)) .( سعداللە شێخانی، گوڵبژێرێك لە فۆلکلۆری کوردی، ل 71)

4- (( لە دەرێ یێکە، لە ژووری دووانە؟)). (زرار خدر رەسول- هەولێر)).

5- ((مامکێ من هەیدەرە، دوو کراسی ل بەرە، ئێك سپیێیە ئێك زەرە؟)).
((هاتە مالامە عەنتەر، دوو کورتەکیت بەر، ئێك سپیێیە، ئێك زەر؟).
((عەمەرە عەمەرە، سێ پیستی سپیێیە و ئێکی زەرە؟)).
((حەیدەرە، سێ قوتك لبەرە، دوو سپیێنە، ئێکی زەرە؟)).
(أحمد عبدالله زەرۆ، مامکێن کوردی،بغداد،1985 ، ل50).
((عومەرێ مام عومەر، دوو کراسی سپیێنە، ئێکی زەرە؟))
(پێزانی ئالیخانی، دوو مراری ژ گەنجینا فۆلکلۆری کوردی، هەولێر، 1985، ل26).

6-((کـلاوی هەمزە پـاڵەوان، بـێ دوورمـان و بێ نیشـان (نـە تیکی هەیە نە درومان)؟)). سەردار فەتاح (1977) خەرمانێك لە مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی ل 10.
عومەر ئیبراهیم عەزیز، فۆلکلۆر، بەشی دووەم، ل13 (ڕاستمان کردۆتەوە).
((کلاوی هەمزە پاڵەوانی، نە دەرزی دیوە نە درووومانی؟)). (بڕەك ئەیوبیان- ل 17)

7- ((قەراتۆکەی گێچینە (هێسکەی کادینە)، هیچ پێبلقەی لێنینە، مردی تێدا زندینە؟)). (سەعدولا شێخانی، گولبژێرێك..،ل71.( تەواو کراوە)

8-((قەلایەکم هەیە گەچ گەچێن، نە پای هەیە نە پاچێن، ؟)) (محمد مەلا کریم، ڕۆژی کوردستان، ژمارە63،ل 40)
((قەلای گەچین، ڕێی نییە تێی بچین؟)). ( سەردار فەتاح/ خەرمانێك...، ل10.
((قەلای گێچی، ڕێی نییە تێیچی؟)) (بڕەك ئەیوبیان، هەتەڵەی ...، ل17).

9- ((قەسری سپی بێ دەرك)). ((قەسری سپی بێ دەرکە؟)).
(ئاواز دزەیی، فۆلکلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا ،1984، ل94.).
((خانیی بێ دەری؟)) ( ئەحمەد زەرۆ،مامکێن کوردی، ل 53،).
((قەسری سپی بێ دەرگەهـ؟)) (احمد قرنی،کانی،1984، ل145).
((قەسرا سپییە، بێ دەریە؟)) (پێزانی ئالیخانی، دوو مراری...، ل26).

((گومەتی سپی بیٚ دەرك؟)) (عمر ابراهیم، فۆلكلۆر،بەشی دووەم،1985، ل13).
((مامكیٚ منۆ خانییٚ بیٚ دەری؟)) (ئەحمد عەبدولاّ زەرو،نووسەری كورد، ژ8، ل22).
((لاویٚ (میٚریٚ) زەر، ییٚ دقەسرا سپیدا؟)) ( ئەحمە زەرو،نووسەری كورد ژ8، ل19).
(صدرالدین خۆشناو، كاروان ژ48 ، 1986، ل 106).

10- ((قەسری سپی بیٚ دەرگا، زیندەوەریٚكی وا تیٚدا؟)) .

11-((زەریٚ زەرانی، ل ناڤ میٚزەرا كتـــانی، نە ل عەردییە نە ل عاســـــمانی؟)).
(پیٚزانی ئالیخانی،دوو مراری ... ل25.)

12- ((مــەتەلۆك و مەتەلۆك، قوینا تە دكەم مەنجەلۆك، ئاڤكیٚن بانا، شلقا ل خۆ ددەت، ییٚ دبەمە دهۆك؟)). ( پیٚزانی ئالیخانی، دوو مراری ...، ل37.)

13- ((پاروی قونیٚ (تیكەی قینگ) دەخۆی، یان دەرخۆنەی قوزی؟))
(سەردار فەتاح / خەرمانیٚك لە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی ل27)
وەڵام : هیٚلكە دەخۆی، یا دونگی بەرخۆڵەی میٚ (دەرخۆنە= سەرپۆش).

14- ((زینــدوو لە مــــردوو پەیدا دەبیٚت، مردووش لە زیندوو پەیدا دەبیٚت؟)) مریشك هیٚلكە و جیقنە دەكات. هیٚلكەش دەبیٚتە مریشك. ناوەڕۆكی مەتەڵەكە لە ڕوی زانستییەوە ڕاست نییە چونكە هیٚلكە زیندووە، ئەگەر بمریٚت نابیٚتە جوجەڵە.

15- ((وەكی دەبی مــــردییە حەرارە (حەلاّڵە)، هــەر مــــردییە و حـــەرامە دەبی، لەپاشان حەرار(حەلاڵ) دەبیتەوە؟)) (بەناتەواوی لەگۆڤاری كاروان، ژ 48، ل106 بلاّوكرایتەوە). هیٚلكەی حەرامە:= هیٚلكەی پیس بوو، هیٚلكەیەك كە خویٚنی بكەویتیٚ یا تیٚك بچیٚ.

16- ((ڕیتۆ ژ پیرتو دبیٚت، پیرتو ژ ڕیتو دبیٚت؟)).احمدعبدالله زەرۆ، مامكیٚن ..ل60.

17-((یەك فەردە خــوێی دێنیٚ، دەیخەینە ناو خــوێیٚ هەر ســوێر نابیٚ؟))
(فخرالدین رؤوف ،چەپكێك مەتەڵی..،ل39).

18- ((بلـــوورین گومەزێكم دی، مــەهو ڕۆژی لە نێودایە، كە ڕۆژ هەڵـــدیٚ لە گومەزدا، بلوورین شووشە ئەشكێنیٚ، بەفیكری خۆت هەڵی بێنە، موعامەیەكی هیند سەهلە كە تەیرۆكەش هەڵی دێنیٚ؟)). كامەران موكری، فۆلكلۆر- هەوزلێر.

19- ((نەمریشكە نەباڕۆكە، بەسەری خۆی دادا سپی چارۆكە؟))
(بڕەك ئەیوبیان، هەتەڵەی كوردی...، ل22.)

20- ((خڕە وەك گۆ...سپییە وەك دۆ..؟)) (سەردار فەتاح،خەرمانێك،ل15.)

**بۆ خوێندنەوەی چەندین دەقی دیكەی تایبەت بە هێلكە تكایە بڕوانە بەشی تایبەت بە گیانلەبەران – هێلكە - لاپەڕە 217-219.**

## بەراوردکردنی مەتەڵی کوردی لەگەڵ مەتەڵی هەندێك نەتەوەی دیکە :

هەمووەمان دەزانین کە نـەتەوەکان بە درێــژایی مــێژوو شتیان لە یـــەکدی وەرگرتووە، بە تایبەتیش ئـەوانەی لە یەکدی نزیکن، هەروەها لە زۆر قۆناغ و ژینگەی هاوشێوەشدا بیروبۆچوونیان یەك دەگرێتەوە و خــاڵی هاوبەشیان هەیە، بـەڵام نەتەوە زیندووەکانیش هەریەکە و تایبەتمەندی خـــۆی هەیە و، لە دابونەریت کــەلتوور و ...یدا رەنگدەداتەوە. هەرچەندە بەراوردکردنی مەتەڵەکانمان لە گەڵ مەتەڵی نەتەوەکانی هاوسێی و زل نەتەوەکاندا لە پلاندا نەبوو، چونکە کارێکی دژوارە و کار و کاتی زۆری دەوێت، بەڵام لەوکاتانەی کە بە دوای تەواوکردن و ساغکردنەوەی ناوەرۆکی کتێبەکەدا دەگەڕام، بەرێکەوت نموونەی مەتەڵی ئینگلیزی و عەرەبی و تورکی و فارسیشم گیردەکەوتن،بۆیە پتر ئاوڕم لەم بوارە دایەوەو لەتەك دەقی مەتەڵیکوردی پەیوەندیدارە تۆمارمکردن. لێرەدا تەنها هەندێك خاڵی هاوبەش و هاو شێوەمان تۆمارکردووە و خۆمان لە تایبەتمەندییەکان لاداوە:

**یەکەم: نموونەی مەتەڵی ئینگلیزی:-**

1- ((بیبینــی لەبــەری ناکـەی، لەبـەری بکـەی نـابیبینی)) (خـەڵات،کفن، بـەرگی مردن)

((ئەوی دروستی بکا بەکاری نایێ، ئەوی بەکاری بێنی دروستی ناکا)) (کفن- گۆڕ)

The man who invented it doesn't want it. The man who bought it doesn't need it. The man who needs it doesn't know it. What is it?[57] A ( Coffin )

ئـەوە چییە: ئـەوەی دایهێنـاوە(دروسـتی دەکـا) نایـەوێ، ئـەوەی دەیکـڕێ گـەرەکی نییـە، ئەوەشی دەیەوێ نازانێت بۆ ئەوە؟ (کفن)

((ماهو الشيء اذا لبسه شخص لايراه واذا راه لايلبسه؟))[58]

2- ((لەبەردی بدەی ناشکێ، لە داری بدەی نادڕێ، خەنجەری لێ بدەی نایبڕێ، لە ئاوێی بدەی تەڕ نابێ( ناخنکێ)، لە ئاگری بدەی ناسووتێ؟))(سێبەر- تیشك - دەنگ)

---

57- ئەنتەرنێت ویب: (rinkworks. Com/brainfood) Riddles. Com

58- رجاء ناجي الدبو (1985) الألغاز متعة وفائدة، بغداد، ص 8.

I'm the part of the bird that's not in the sky. I can swim in the ocean and yet remain dry. What am I? (shadow) (من بەشێکم لە باڵندە کە لە ئاسمانا نەبێت(نەفڕێت)،

لە زەریاشدا(لە ئاودا) مەلە بکەم هەر وشکم، من کێم؟ (سێبەر)

3- ((ئەڕوا و پێی نییە، هاوار ئەکا زمانی نییە، فرمێسك ئەڕێژێ چاوی نییە؟))

(هەور و بروسك و باران)

What can run but never walks, has a mouth but never talks, has a head but never weeps, has a bed but never sleeps? (A river)

ئەوە چییە رادەکات بەڵام هەرگیز هەنگاو نانێ، دەمی هەیە بەڵام قسە ناکات، سەری هەیەو ناگرییێ، جێگای‌خەوتنی هەیە بەڵام هەرگیز نانوێ؟ (رووبار)

4- ((هەمو شتێك دەخواتەوە ئاو نەبی، کە ئاو بخواتەوە دەمری؟)) (ئاگر)

FireGive me **food**, and I will live; give me water, and I will die.What am I?

(خواردنم بدەیێ دەژیم، ئاو بدەیتێ دەمرم، من کێم؟ ) (ئاگر)

((وآكلة بغير فم وبطن، لها الأشجار والحيوان قوت، اذا أطعمتها انتعشت وعاشت، واذا سقيتها ماء تموت؟)) [59]

5- ((بەری هەسانە، پشتی خورییە، بەڕۆژ تێرە، بەشەو برسییە؟)) (کلاشی بەن)

((بەڕۆژ ئاوسە ، بەشەو قسرە؟)) (کەوش، کاراش، کلاش، پێلاو، پێتاو)

I run over fields and woods all day. Under the bed at night I sit not alone. My tongue hangs out, up and to the rear, awaiting to be filled in the morning. What am I? A shoe

بە درێـژایی رۆژ لـە کێڵگـە و لەسـەر دار و چیلکە رادەکـەم، شـەوانیش لـە نێـو جێگـەدا بەتەنها نیم، زمانم دەرهێناوە، چاوەڕوانم بەیانی پڕببمەوە، من چیم ؟ (تاکە پێڵاوێك)

6- ((بەزەوی دابدەی ناشکێ، بەزێیی دابدەی دەشکێ ؟)) (کاغەز)

((ئەی‌دەم بەدارا نادڕێ، ئەی‌دەم بەبەردا ناشکێ، ئەیدەم بەئاوا ئەدڕێ ؟)) (کاغەز)

Throw it off the highest building, and I'll not break. But put me in the ocean, and I will. What am I? (A tissue A wave) (ئەوە چییە: لە بەرزترین شوێن فڕێیبدەیت ناشکێت(

59- مکتبة دار ابن النديم( ) الحوازير الشعبية، ص 28

بەلاّم بیخەیتە ناو ئاو دەشکێت؟ (کلینکس – پەڕەی کاغەز– شەپۆڵ)

7– ((سەری ئەبڕی و بۆی ئەگری؟)) ،((سەری دەبڕی و پێیدەگرییێ؟)) (پیاز)

((پڕ بە دەستە و ئەیگــری، هەر بۆخۆت سەری ئەبـــڕی، ئەوسا دواتر بۆی ئەگری؟))

You use a knife to slice my head and weep beside me when I am dead. What am I?

)An onion( تۆ سەرم بە چەقۆ دەبڕی، کە دەمرم لە تەکما بۆم دەگری.من چیم؟(پیاز)

((هم دوغراسان، هم ییغلاسان؟)) (وردی دەکەی و بۆی دەگری: پیاز)

دووەم :نموونەی مەتەڵی عەرەبی:–

1– ((لە نێوان زەوی و ئاسماندا چی هەیە؟)) (پیتی و)

((ما هو الشيء الذي بين الأرض والسماء؟)) (حرف و)

2– ((شورەی سەوز، عەسکەری ڕەش، رووباری سوور، کلیلی ئەو شارە چەقۆیە؟))

((دەریای سوور، ماسی رەش؟)) (شووتی)

((مدينة خضراء، انهارها حمراء، سكانها عبيد، مفتاحها حديد؟)) ( رقي)

((اللهە یاپار یاپسینی، دمیر آچار قاپسیتی؟)) (دروستکەری یەزدانە، کلیلەکەی ئاسنە)

3–((خان و مان کچە پاشایە، سی و دوو کراسی لەبەردایە؟)) (سەرکە کەلەم– پیواز)

((کچا میری ،سەد کراسێت لبەر؟)) (( بنت الحاكم، لابسة الف فستان) (لهانة, بصل)

4–((ســکی بەرخـــە، پـــشتی کـــارە، کلـــك مەقـــەرە (مەقەســـە)، ســـەری مـــارە))

(پەڕەسێلکە) ((کلك مەقەس، ڕوو هەترەس؟)) ، ((رأسه جرس، ذيله مقص، بطنه شحم، ظهره فحم؟))

5- ((بە شانت، بە شەرواڵت، زاوای خاڵت، هاتە ماڵت، چی دەدەیتێ ؟))

((مێردی بووکی نەنکت، هاتە ماڵت ،چیئەدەیتێ)) (باوکت بێتەوە چی ئەدەیتێ)

((خوشکی خارتە(خوشکی خاڵتە) و پلکیشت (پووریشت) نیە؟)) (دایکتە)

**((عمتك أخت ابوك، خال ابنها شيصير منك؟))60** **(والدي)**

6- ((پیاوێك بانگی پیاوێكی دیكەی دەكرد ودەیگوت: . هــۆ! هــۆ! خاڵە! ئەتۆ خاڵی منی و ئەمن مامی تۆمە، باوكی من باپیری تۆیە! ئەم خزمایەتیە چۆن دەشێت؟)) ل 109

**((رجل زوج ابنة ام البنت، واتىالبنت بالزواج الحلالِ... فاتت منه بنت قالت الشعر، وقالت لابن هاتيك خالي...جدتي أمه وأبي جده، وان عمه له وهو خالي.؟ كيف تم ذلك))**7

7- ((من كێم؟ئەگەر نێم داوام ئەكەن، ئەگەر بێم لەبەرم رائەكەن؟)) **(باران)**

**((يطلبني الناس اذا غبت عنهم، ويدعون الله لأحضر، فاذا حضرت هربوا واختبأوا؟))61**

8- ((دووكەسن ،ێكەوە دەنون و پێكەوەهەڵدەستن، پێكەوە دەڕۆن و پێكەوە دادەنیشن، پێكەوە دەگریێن و پێكەوە پێدەكەنن و یەكدیش نابین؟)) **(دوو چاوی مرۆڤێك)**

((دوو باز لە قەد چیان، بەرامبەر یەكن و نابینان، بیانگرن دەمرن، بەریاندەن دەفڕن؟))

**((من أنا؟ اننا أختان نسكن في جهتين متقابلتين ولكن أحدانا لايرى الأخرى؟))62**

9- ((سەری دەتوو، بنی دەدایكت؟)) (مەمك) **((راسه بك، عرقه بأمك))**

10- ((بەچاران دەخشی، بەدووان دەڕوا، بەسێیان دەلەنگی؟))

((ئەڤ چییە، سڤە چارە، نیڤرۆ دوویە، ئێڤار سێیە؟)) (تەمەنی منداڵی و گەنجی و پیری)

((سپێدێ لسەر چارا دچیت، نیڤرۆ لسەر دوویا، ئێڤاری لسەر سێیا دچیت؟))

**((على أربعة يدب وعلى اثنين يسير, وعلى ثلاثة يزحف؟)) 63**

11-((بەرەڵاێكەی ڕادەوەستێ، ببەستییەوە دەڕوا؟)) **(پێڵاوی بەقەیتان)**

((هەتا نەیبەستییەوە ناڕوات؟)) **((ما الشيء الذي لايسير الا اذا ربطته؟))64**

---

**60- دار ابن النديم الحوازير الشعبية، مبناها ومعناها- 222حزورة، بغداد، ص 30**

**7- رجاء ناجي الدبو(1985)، الغاز وتسلية، بغداد، ص 9.**

**61 -عبدالاله رؤوف ( 985) كتاب الألغاز (( اختبر ذكائك ))ص 14.-**

**62- عبدالاله رؤوف ( 985) كتاب الألغاز (( اختبر ذكائك ))ص 14.**

**63- عبدالاله رؤوف ( 985) كتاب الألغاز (( اختبر ذكائك ))ص 25.**

**64- دار ابن النديم ( ) الحوازير الشعبية، مبناها ومعناها- 222حزورة، يغداد 23**

12- ((زیندوو، مردووەك رادەكێشن، زیندوو بێ دەنگن، مردوو دەدوێتن؟))     (خامە)
((پێنج دساخن، نا ئاخڤن، ئێك مریە دئاخڤیت؟))     (خامە، قەلەم)
(( ثلاثة يحملون ميتا، الميت يتكلم وهم لايتكلمون؟))65

13- ((بە چوار برا سەرێكیان هەیە؟)) ((من انا؟ اننا اربعة اخوة ولنا راس واحد؟2))66 (مێز)

14-((زیندو هات بەفێڵ، مردووێكی ناشت، بەری دارەكەی ئادەمی لێ ناشت، زیندوو بۆ خواردن هاتە سەر مردوو، مردوو هەڵبەزی، زیندوو پێوە بوو؟))
((وما من ميت كفنته و دفنته، فقام الى حي صحح فأوثقه؟))67

15- ((دە لە دەیان دەربێنی دەمێنێتەوە دە؟))(پەنجەوانە و پەنجەكانی هەردوو دەست)
((كيف تنتزع عشرة من عشرة ويظل الباقي عشرة؟))[8]

16- ((سێ پێنج پازدە، دوو حەڤدە، سێ بیست.))     (20 = 3+ 2 + 5 × 3 )
((عشرة وعشرتين وبقدها مرتين،وخمسة وثلاثة واثنين،كم))68 { 10+(2×10)}×3+5+3+2=100

17- بڕوانە پەڕاندنەوەی ((مەلا ومەلاژن، قەشە و قەشەژن....)) ل 240
((اظطر ثلاثة رجال وثلاث نساء الى عبور النهر، وكان كل منهم غيور على زوجته، ،ولكن لم يكن بالنهر الا قارب واحد لايسع الا شخصين، فكيف استطاعوا عبور النهر بدون ان ينفرد احدهم الى زوجة الاخر؟))69.

18- تەتەڵەی زمان: ((كەلە كۆتكی ئاشی سوسێ، بە شەوی سێشەم دەسووتێ.))
((سدينا صدر شط السيد, والسيد ما سد صدر شطنا))*

---

65- رجاء ناجي الدبو(1985)، الغاز وتسلية، بغداد، ص 8.
66 – عبدالاله رؤوف ( 985) كتاب الألغاز (( اختبر ذكائك ))ص 14.
67- جوزيف فاخوري ( ) حك دماغك ، هل انت ذكي- المكتبة الحديثة، بيروت ص 24.
8- رجاء ناجي الدبو(1985)، الغاز وتسلية، بغداد، ص 8.
68- مكتبة دار ابن النديم ( ) الحوازير الشعبية، مبناها ومعناها- 222حزورة، بغداد 31.
69- جوزيف فاخوري ( ) حك دماغك ، هل انت ذكي- المكتبة الحديثة، بيروت ص15.

## سێیەم:- نموونەی مەتەڵی تورکی

1- ((ساجی زل زل، کەوتە مەنزڵ، کۆڵەکەم نەوی، بە خولا(بەغدا) ڕەوی؟)) (بروسك)
((بردَن وردم قلنجن حَلبتَ جختِ اوجي؟))[70] (لێرە شیرم وەشاند لە حەلەب دەرچوو:بروسك)

2- ((ئاسۆیەکی نزمۆکە، لێی ئەباریٚ بەفرۆکە؟)) (هێلەگ و ئارد)
((هەورۆکە هەورۆکە لێی دەباریٚ بەفرۆکە؟)) (هێڵەگ و ئارد)
((کجك دَمدَ قارياغر؟)) (لە سەر بانی بچووك بەفر دەباری:. هێڵەگ و ئارد)

3-((پەچە ڕەشی بزن جینگانە؟))،((حەوشەی ڕەشە و جرتوفرت؟))(برێشکەی ناو ساج)
((کجك دَمدَ جين اوينَر؟)) (لە سەر بانی بچووك ئەجندە یاری دەکەن:. برێشکە)

4-((ئەم لای دیوار، ئەو لای دیوار، ناوەڕاستەکەی سەگێکی(گورگێکی) هار؟)) (زمان)
((اوياني ديوار بوياني ديوار، ايچندەوار دەلی داوار؟))
(ئەملی دیوار ئەولای دیوار، تێیدایە دەوارێکی هار: زمان)

5- ((ژ ژەهری تاڵترە، ژ هنگڤینی شرینترە؟)) (زمان)
((بالدان تاتلی، زهيرون آجي؟)) (لە هەنگوین شیرنترە، لە ژەهر تاڵترە: زمان)

6- ((ئەمە چیەیە لەم شارە،ددان دارە وەك مشارە،هەردوو دیوی بەکارە، ئەفرۆشیٚ بە پارە؟))، ((دەوی(دەمی) نییە و ددانی هەیە؟)) (شانە)
((دیشلری وار،دیشلمز؟)) (دانی هەیە و ناگەزێ: شانە)

7- ((سەری سوٚرە سەلامەت، بنی قوٚڵە قیامەت، بە تەڕی تێی دەنێن بە هیشکی دەردێنن، سەڵی عەلا محەمەد؟)) (تەندوور)

---

*- مكتبة دار ابن النديم ( ) الحوازير الشعبية، مبناها ومعناها- 222حزورة، يغداد 42.

70- مامۆستا (سەید تەلعەت خەفاف ، 59 ساڵ، هەولێر) .

((**بر قوطوم وار علامت، ایچندەوار قیامت، یاش ووردم قوروچیندی، صلوا علی محمد؟**))

(قووتییەکم هەیە عەلامەت،لە ناویدا قیامەت،بە تەڕی تێی دەنێی، بە وشکی دێتە دەرێ)

8- ((هندی دبەزیت ، ژ جهێ خۆ ناچیت؟)) (ماتۆڕی ئاو- ئاشی ئاو-مەشکە...)

((**گیدەر گیدەر یریندە، آلتون کمر بیلندە، گیجە گوندوز یول ایدر، گتە دوروب یریندە؟**))

(دەڕواو هەر لە جێگەی خۆیەتی، قایشی زێڕی لە پشتێ، شەو و رۆژ رێی خۆی دەکا، وەستاوە لە شوێن خۆیدا: ئاش)

9- (سەوزە سەید نییە، سپییە حاجی نییە، قژی هەیە دەروێش نییە: تەڕەپیاز)

((**یشیلدی سید دەگی، بیاضدي حجی دەگی، صاچی وار درویش دەگی؟**))

10- ((کلاٌفەی کەوە، مرغی بێ زمان، هەرکەسێ هەڵیبێنێ ئافەرین جەوان؟)) (ماسی)

((**حیواندە دیلسیز؟**)) (گیانلەبەرێکی (ئاژەڵێکی) بێ زمانە: ماسی)

11-((فڕنی فڕنی فڕناوێ، گێزبەلەی بەر هەتاوی، سووژنی لە قوونێ باوێ (درێشەی لە کوونێ هەردەی)، هەوەست دەچێتە ماستاوێ؟))،((ناوی ئاسن دەری گۆشتە؟))(کەباب

((**ایچی دمیر ئوستی خمیر؟**)) (ژووری ئاسن،دەری هەویر: کەباب)

**چوارەم:- نموونەی مەتەڵی فارسی:-**

1- ((کشتێکی عاجباتیم دیت لەم دەشتە، رەوان (رۆح) چوارە، بە لەش پێنجە، بە قاچ هەشتە؟)) (چوار پیاو تەرمی مردوویێکیان لەسەر دارەبازە هەڵگرتوە و بەرەو گۆڕستانی دەبەن، چواریان زیندوون و گیانیان هەیە، پێنج لاشەنە، بە هەشت لاق بەرە و گۆڕستان دەڕۆن.)((**عجایب دیدم چیزی در این دشت، به تن پنج و به روح چهار و به پا هشت؟**))[71]

2- ((شتێکە خوێنی رەش دەخوا و بە رێگای سپی دادەڕوات، بکەوێتە دەست زانا دنیای پێداگیر دەکات، نەزانیش (ئاژەڵیش) بە خاوی دەیخوات؟)) (نەی،قەڵەمقامیش)

71- **مامۆستا ( وریا قاتع ،61 ساڵ ، هەولێر)، مامۆستا حەکیم مەلا سالح – هەڵەبجەیی.**

((**این چیست رفتنش راه سفید، خوردنش خون سیاه**؟))؟؟؟

3- ((**خوا نەیکردووە و هەس**))، ((**خوا نەی کردووە و هەیە**؟))　　**(قامیش، نەی)**

(( **این چیست کە خدا نی افریده، سبزاست و بلند و قد کشیده**؟))　　**(نی)**

4-((**تانجییە زەردی زڕزڕە لە گوێ، سەیران ئەکا لە دەوری دێ** ؟))　　**(زەردەزیڕە)**

((**یك تازی دارم موذی،افسارش طلا درزی،گر باتو کنندبازی،صد نعره براندازی**))

5- ((**آن چیست کە جسمش آهنینست، گهی اندرهوا گە برزمین است**))　　**(فرۆکە)**

6-((**عجب صنعتی دیدم درین دشت، بیجان پیجاندار می گشت**؟))　　**(تفەنگ)**

7- ((**چیست آن مرغ بی بال و پر، سرش رانبری نگوید خبر**؟))　　**(زەرفی نامە)**

## چەند سەرنجێك دەربارەی هەندێك مەتەڵی كوردی چاپكراو

وا شوڵكوتێكی[2] پێش دەست و بەركوتێكی لێكۆڵینەوە لە مـــەتەڵی فۆلكلۆری كوردی دەكەین، سێ كۆمەڵە مەتەڵی بڵاوكراوە، وەك نموونە دەخەینە تای تەرازووی شیكردنەوە و هەڵسەنگاندن، هیوادارم بەسنگێكی فراوان و دڵێكی گەورە وەری‌بگرن، دوور بن لە خـــــۆهەڵكێشان و یەكتر داكێشان. ئـــامانجی ســـــــەرەكیمان هەڵگرتنی خەرمانی خەبات و ڕەنجی باپیران و دەوڵەمەند كردنی گەنجینەی میللەتە چەوساوە و بێ‌پشتەكەی خۆمان بێت و هیچی‌تر نا.

ئەم سێ كۆمەڵەیەشم بـــۆیە هەڵبژارد چونكە بەڕێزان: مامۆستایان ئـــۆرخانی غالب و ڕۆستەم باجەلان و محەمەدی مەلاكریم زۆر لە مێژنییە بڵاویان كردونەتەوە و هەوڵی لێكدانەوە و لێكۆڵینەوە و قووڵبوونەوەیان بەناخی مەتەڵەكاندا داوە. تاكو ئێستاش لە كۆشش و بەهرە و بەرهەمی ئەدەبی بەگشتی بەردەوامن، لەم بەركوڵەدا بەگوێرەی توانا و دەسەڵات و بۆچوونی خۆم، بەنیازی یەكلا كردنەوە و بەراوردكردنیان لەگەڵ تێكستی لەبار و ڕەوانتری هەمان مەتەڵ كە لەبەر دەستمان دانە و هەندێكیشیان تاكو ئێستا بڵاونەكراینەوە، دەخەینە بەر وردبینی لێكۆڵینەوە، هەڵبەتە دەقـــــی ئـــــەم مەتەڵانـــــەی كەمن بەڕاستتریان دەزانم، ئەوانیش بێ كـــەموكورتـــی نین، هەموو بۆچوونەكانی منیش سەد لە سەد ڕاست نین، چاوەڕێی زانا و ڕۆشنبیر و دڵسۆزان لە گشـــت كـــونجێكی ئـــەم نیشتمانەدا دەكـــەین كە لیـــــێكۆڵینەوە و توێژینەوەی تێروتەسەلتریان لەبارەیەوە بكەن.

---

2- لە ساڵی 1987 نوسیوومە و لە ژمارە 126 ی 1998 ی گۆڤاری كاروان بڵاوكراوەتەوە، دەسكاریم كردۆتەوە.

## 1- چەپکێك گوڵاڵەی ڕەنگاوڕەنگ لە باخچەی مەتەڵی کوردیدا:

مامۆستا (ئــۆرخانی غالب) لە پەرتــووکی (چەند باسێکی ئـــــەدەبی، 1984، سلێمانی)دا لەژێر سەردێڕی (چەپکێك گوڵاڵەی ڕەنگاو ڕەنگ لە باخچەی مەتەڵی کوردیدا) لەلاپەڕە (25–31)دا (34) مەتەڵی فۆلکلۆری چاپ کردووە. کە پێشتر بەڕێزیان لە ژێر هەمان ناونیشان دا لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نویٚ، ژمارە (94) ساڵی 1982 ل 78–79دا بلاّوی کردبوونەوە.هەر لە چەند باسێکی ئەدەبی دا (27) مەتەڵی دیکەی لە لاپەڕە (32–36) بلاّوکردۆتەوە و دەفەرمویٚ:.

((دەربەستم چەند دانەیەك لەو مەتەڵۆکانەی لامان دەست دەکەون بەسەر بکەمەوە کە تا ئێستا شەقامەڕێی چاپ و بلاّوکردنەوەیان نەدیتوە)). مامۆستای بەڕێزمان بۆ ئەنجام دانی ئەم کــارە ماندووبوونی کـــەمی نەکێشاوە. بەروبوومی شەکەتیەکەشی شایانی ڕێزلێنان و دەسخۆشییە، بەلاّم ئێمە لەم بەرکوتەدا بە هەبوونی سەرچاوەی زۆرتر و کــــاتی پتر و قوڵبوونەوەی فرەتر، دەمانەوێت بە بۆچوونی خـۆمان کەم و کورتییەکانیان دیـــاری بکەین و ڕاستکردنـــەوەکانیشیان بخەینە بەرچـاوان، وەك ئاشکراشە دەقی مەتەڵەکان زادەی بیری من و مامۆستای ڕێزدارمان نین.

نـــامانەوێت بڵێین چــــەند لەم مەتەلاّنەی لیستەی دوایی. کـــەی و لە کویٚ بلاّوکراونەتەوە، چونکە تەنها مەبەستمان ڕوون کردنەوەو دەرخستنی کەم و کورتی مەتەڵەکانە، بەلاّم پێنجیان هەر لە هەمان سەرچاوەدا لە لیستی یەکەم بەبلاّوکراوەی پێشتر زاندراون، کـــەچی لەلستی دووەمـــــدا دووبارە بەشەقامەڕیٚی ((چـــاپ و بلاّوکردنەوە))دا هەنگاویان نـــاوە و بلاّوبوینەتەوە، پێشتریش لە (ڕۆشنبیری نـــویٚ ژمارە 94)دا لەلاپەڕە (78–79) بلاّوی کردوونەتەوە. مـــەتەڵەکان بەگشتی کەم و کورتی ئاشکرایان پێوە دیـــارە. کەمیش سەروەشێن نـــەکراون، ئەگەر بە درشتیش مەتەڵەکان بخوێنینەوە، هەندێك لە هەڵەکانیش بخەینە ئەستۆی چاپ، ئەوا ئەم چەند مەتەڵە هەر دەستەویەخەمان دەبن و بەرۆکمان بەرنادەن:

1– ((بەوشکی لە زاری دەهاوم، بەتەڕی دەری دێنمەوە؟))

**وەڵام : لغاوی ئەسپ،** (چەند باسێکی ئەدەبی– ل33)

**خۆ ئەگەر منداڵێك نوقڵێك بە وشكی بخاتە زاری، ئەوا بەتەڕی دەری دێنێتەوە!**

**دەقی تەواوی مەتەڵەكە** ((یەکت لێ دەکەم (1)، یەکت لەبن زگی ڕادەکەم (2)، یەکت لەبن کلکی دەنێم (3) دووت پێوە دەکەم (4)، دووت لێوە دەکەم (5) دووی دیت بەسەر قونێدا شۆڕدەکەمەوە، بەهیشکی تێت دەنێم، بەتەڕی دەری دێنمەوە (7) ؟)) **وەڵام (1) یەك زین لە ئەسپ دەكرێت. (2) تەنگە كێش (تەنگەبەند) (3) قوشقونە (پارو، ژێركلكە). (4) ركێب (ئاوەزەنگ)، (5) ڕێشمەو دەسجڵەو، (6) گوڵنگەی پاشكۆی زین، (7) لغاو. (لە حاجی محمد سلیمان شێخ بزێنی، ڕاوچی، وەرگیراوە). كە زانیارییەك لە دەقی مەتەڵەكەدا دەربارەی پرسیار لەبارە كراوەكە دەدرێت پێویستە زۆر تایبەتمەندبێت بۆ ئەوەی لە میانییەوە بگەینە وەڵامەكەی، ئەگینا دەیان وەڵام سەرهەڵدەدەن و ناشتوانین ڕەتیان بكەینەوە. هەرلەم بارەیەوە گوتویانە: ((دوانت لێ هەڵكێشم، دوانت لێ ڕاكێشم، بەوشكی تێت ئەخەم، بەتەڕی لێت دەركێشم؟))،(( یەكی لە پشتی، دووی پێوە شۆڕ ئەبێتەوە، یەكی لەبن كلكە، بە وشكی تێی دەنێن، بەتەڕی دێتە دەرێ ؟)) (محمدی مەلا كریم، ڕۆژی كوردستان، ژ 163 ســاڵی 1981، ل 38 ،42). هەروەها دەڵــێن:((یـــەكێكی لێ ئەكەم، دووانی پیا بەر ئەدەمەوە، بە وشـــكی تێی ئـەخەم، بە تـــەڕی دەری دەهێنمەوە))، (سەردارفتاح، خەرمانێك...1977، ل 27).**

1- ((بەتەڕی تێی دەنێم، بەوشكی دەری دێنمەوە؟)) واتە نان.

**(چەند باسێكی ئەدەبی– ل33)**

**خۆ دەكرێت كراسێك بە تەڕی بخەینە ناو ئامێری جلشۆرەوە یا خشتێك بە تەڕی بخەینە ناو كورە و بە وشكی دەری بێنینەوە!**

**ئەم مەتەڵەی سەرەوە بەبڵاو نەكراوە دانـــــراوە كـەچی تەنها 2/3ی مەتەڵەكە قرتێندراوە 3/1ی نوسراوەتەوە، بەڵام پێشتر لە زۆر سەرچاوەدا بەتەواوی كەوتۆتە بەرچاوان. وەڵامـــەكەی: (هەویر، هەنگوتك بەتەڕی دەكرێتە نـان و كولێرە و دەخرێتە ناو تەندوورەوە كە برژا (ووشك بوو) دەری دەهێنن. دەری تەندورەكەش سوورە و**

**گەرمییەکەشی سەلامەتە، بەڵام ناو تەندوورەکە وەکو ئاگری دۆزەخ جۆش دراوە، بۆیە وەسفی تەواوی مـــــــەتەڵەکە لەم دەقەی خوارەوە هاتووە:**((سەری سوورە سەلامەت، بنی قووڵە قیامەت، تەڕ بەوشکی دەرامەد. صلی علی محمد؟)). **( محدی مەلا کریم، ڕۆژی کـــوردستان ژ63، ل 39)**. **((سەری سۆرە سەلامەت. بنی قۆڵە قیامەت، بەتەڕی تێی دەنێم، بەوشکی دەری دێنم سەلی عەلا موحەمەد))؟ مەتەڵەکە لە (چەپکێك لە مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی ساڵی 1978 ل 37 و لە گۆڤاری پەروەردە و زانست، ساڵی 971، ل 96) بڵاوکرایتەوە.** ((ژ سەرڤە هەلأمەت، ژ بنڤە قیامـــــەت، ب تـــەڕی دبەمیٚ، ب هیشکی دئینم، صلی علی محمد)) **( ئەحمەد زەرۆ، مامکێن کوردی ، ل 23)**.

3- ((چوار مامم هەیە لە ڕۆمیٚ، تیران داوێنە گۆمی؟)) **(چەند باسێکی ل34)**

**مەتەڵەکە بەم شێوەیەی خوارەوە گوتراوە:** ((چوار مامم هەنە لە جۆمیٚ، تیران داوێنە گۆمیٚ؟)) **( فاتح محمد دارەبەنی)، وەڵامەکەی: کە چوار چیچلەی گوانی مانگا دەدۆشرێت، شیرە سپییەکەی وەك تیر بۆ ناو گۆمی مەنجەڵەکە دەچن.**

**((چوار برا هەن لە چۆمیٚ، تیران داوێنە گۆمیٚ؟)) (سەردار فتاح، مەتەڵی... ل16)**

((چوار برا هەنە لە چۆمەکی، تیران داوێنە گۆمەکی؟)) **( محمد کریم شریف، فۆلکلۆری یاریيەکانی کوردەواری، کەرکوك، 1971، ل 179)**.

**ئاشکرایە جۆم و چۆم بۆ ناو گەڵ و گوانی مانگا هاتووە و لێکچواندێکی تێدایە، بەڵام (ڕۆم) ئەگەرچی بەتیر هاوێشتن و جەنگ کردن بەناوبانگ بووین کەچی (ڕۆم) وشەیەکە دوور و نزیك پەیـــوەندی لەگەڵ گەڵ و گوانی مانگادا نییە. وادەزانم کە مامۆستا بـــڕەك ئەیوبیان هەمـــان هەڵەی کردووە کە لە ((هەتـــەڵەی کـــوردی، 1982، ل 10))دا دەڵیٚ : ((چوار مامم هەیە لە رۆمیٚ، تـــیران داوێنە گۆمیٚ؟)) ئینجا مامۆستا ئاگاداری هەتەڵەیە یا نا ، بۆچی ئاماژەی بۆ ناکات ئەو خۆی دەیزانێت.**

4- (ڕەشی بنەبـــانیٚ، هەڵدیٚ لە کـــابانیٚ)؟ لە هـــــەردوو لیستی چەند باسێکی ئەدەبی ل 29 و 35دا چاپکراوە. (وەڵام: کوندە)،

وەڵامی ڕاستی مەتەڵەکە (کوندە) نییە، بەڵکو مەبەست (هیزە)یە، کوندە جێگەی لەسەر کوندەڵانە، تا شەوبای لێبدات و ئاوەکەی ساردبێت، لە بنەبانی خانووش داناندرێت پەند:((دێمکەی (کوندەی) ڕەق وئاوی شەوی، ئاغاو کرمانج ڕێك ناکەوی)) بەڵام هیزەی ڕۆن لە بنەبانی خانووی ماڵەوە دادەنرا، مەتەڵ بۆ (هیزە) دەڵێن:- (ڕەشی لە بنەبانێ، هەڵدێتە کابانێ)؟ (هەمین أحمد عبدالرحمن).
((ڕەشەکەی بنەبانێ، خۆش خۆش دەچتە کابانێ؟)) (عمر ابراهیم، فۆلکلۆر، ب 2، 1985، ل9). کەچی بۆ کوندە دەڵێن:((لە ئاوێ دەردێ، لە کابان (کەیبانە) هەڵدێ))؟ (چەند باسێکی ئەدەبی،ل 29، لە رۆشنبیری نوێ ژ 94 ، ل 79) نووسراوە . ((لە ئاو دەردێ، لە باوکت هەڵدێ؟)) (محەمەدی مەلاکەریم، ڕۆژی کـــوردستان ژ63 ساڵی 1981، ل40) هەروەها دەڵێن: ((یەکی ڕەشی بەموو، لە ئاوێ دەرچوو. سواری پشتی دایکت بوو؟)) (عەیشێی عەزە کوردەی، سەرگەڕان- هەولێر).

وەك لە مەتەڵەکان ئـــاشکرایە و پێشتریش دیـــارمان کرد کە دەڵێن: هەڵدێتە کـــابانێ مەبەست ڕاکردن نییە، بەڵکو سوار بـــوونە، پەند: ((فلأنەکەس گیسکە نێرە هەڵدێتەوە دایکیخۆی)) بەلأم بەپێی دەقی ناوبراو کە مامۆستا ئۆرخان نووسیویەتی ئەوا (هەڵدێ لە کابانێ) واتاکەی وا دێتە بەرچاو کە لە دەست کابان هەڵدێت و ڕادەکات.

4- ((گیان لەبەرە مووی نییە، خواردنی هەیە ری نییە))؟ وەڵام (گەنە)
(چەند باسێکی.. ل 36)

ئەم دەقەی خوارەوە ڕاستترە کە دەڵێن: ((گیانلەبەرە مووی نییە، دەمی هەیە قـــوونی نییە، خـــواردنی هەیە ریتنی نییە؟ )) (حسین عبداللە حاجی یاسین- هەولێر). یان دەڵێن: ((هۆ هۆ! هۆی نییە، چـــەرمۆکەیە مووی نییە. خواردنی هەیە گوی نییە؟)) (سعداللە اسماعیل شێخانی).

خواردن و ریتن لە گیانلەبەرە باڵاکاندا دوو کرداری بەیەکەوە بەستراون، وشەکان دژیەکن و جوانی و ڕەوانی بەمەتەڵەکە دەبەخشێت، بەڵام( خواردن و ڕی)کە لە

**دەقەکەی مامۆستادا هاتووە، ئەگەر ڕێ بە ڕەگی کرداریش دابنێین ئەوا ناوەڕۆك و ڕوخساری هەتەڵەکە هەردزێو و ناتەواو دێتەبەر چاو.**

6- ((لە دوازدان یەکی حەرامە؟)) **(چەند باسێکی... ل36)، (وەڵام: ڕەمەزان)**

**دەقەکەی سەرەوە کورت کراوەتەوە و قرتێندراوە، دەقی مەتەڵکەچەند جوان و ڕەوانترە کە دەڵێن:** ((دوازدە کوزە گندۆرەی (کاڵەکی)ساڵ، یەك حەرامە و یازدە حەڵاڵ؟)). **هەروەها نووسراوە: ((دوازدە گندۆرە، یەکی حەرامە)) (سەعدوڵا شێخانی، گوڵبژێرێك..، ل 75) . ساڵێك دوازدە مانگە، مانگی ڕەمەزان خواردن بە ڕۆژ حەرامە.**

7- ((بەسیٚ برا دۆخینێکیان هەیە))؟ **وەڵام:- سیٚ پای مەشکە.**

**(ڕۆشنبیری نویٚ، ژ94 ، ل 79)، ( چەند باسێکی ئەدەبی...، ل 26 )**

**دەقی مـــەتەڵەکە جـــــوانترە کە دەڵێن:** ((بەسیٚ برایان مێزەرێك، بە دوو کونان گێزەرێك؟)) **(زرار خدر رسول- هەولێر) وەڵام: (سێپێك و لۆلەپ و ناودۆکی مەشکە)یە هەروەها:((بەسیٚ برا کلاٚوێکیان هەیە)) (سەردار فتاح، خەرمانێك ، ل38)**

**بەسیٚ برایان مێزەرێك، کلاٚوێك، جامانەیەك، شاشکێك بۆ سێپێك دەڵێن چونکە سیٚ پا لەسەرەوە بەیەکەوە دەبەسترێنەوە، لەناو قەدڕا نابەسترێت هەتا دۆخین و پشتێن بەکار بێنن، بەنەخوێن بۆ ناو قەد بەستن دروست کراوە، مێزەر و جەمەدانیش بۆ سەربەستن بەکاردێن، هەروەها ((بەسیٚ برایان مێزەرەك؟))، (عمر ابراهیم، فۆلکلۆر ب2، ل 14) بۆ فەرشە (خوان، پنە) گوتراوە جوانتریشە کە گوتویانە** ((بەسیٚ برایان مێزەرەك بە دوو خوشـــکان گێزەرێك؟)) **سیٚ بـــرا، سیٚ پێچکەی فەرشەیە، مێزەر، پانی خوانەکەیە کە لەسەر هەرسیٚ برایانە، دوو خوشك هەردوو دەستی خاتوونی نانکەرە، گێزەرەکەش تیرۆگە. بۆ سێپێك ئەم مەتەڵەش دەڵێن: ((سیٚ پیٚی شەش گویٚ؟)) چـــونکە زۆربەی داری سێپێك داری دوو گوێیە (دوو لکـــە) تـــا لەیەکدی نەترازێن وەك بە کۆڵەگەی دوو گویٚ دەڵێن ((یەك پیٚی دوو گویٚ بار هەڵگری (کا) نەخۆر؟)). بۆ هەرزاڵەش گوتراوە:((چوار پیٚی هەشت گویٚ، بار هەڵگری جۆ نەخۆر))؟.**

8- ((دارەوەنیٚ، لەسەر کەنیٚ، شێخ و مەلا دەستی پێوە ئەگری؟))

**وەڵام: لووت...** ( **خەرمانێك...**، ل27)، (**ڕۆشنبیری نویٚ ژ** 94، ل79).

**بەڕاستی لووت بڕینیش هەر ئەوها دەبێت، سەیری دەقی تەواوی مەتەڵەکە بکەین کە پێشتر چەند جار بڵاوکرایەتەوە** ((دارەبەنیٚ، لەسەر بەنیٚ، میرو حاکم دەست دەکەنیٚ؟)).

((**دارەبەنیٚ لە قەد کەنیٚ، شێخ و مەلاٚش دەست دەکەنیٚ**؟)) (**صباح اسعد خۆشناو**) **یا** ((**دارە بەنیٚ لەقەد کەنیٚ، شێخ و مەلاٚ دەستی ئەدەنیٚ**؟)) ( **محمدی مەلا کریم، ڕۆژی کوردستان**، ژ63، ل 38) ،

((**کۆڵە بەنیٚ، لەبن بەنیٚ، میرو حاکم دەست لۆ بەنیٚ**؟)). ( **صدرالدین خۆشناو، کاروان**، ژ48، ل113). ((**دارە بەنیٚ لە گویٚ کەنیٚ، شێخ و مەلا دەستی دەنیٚ**))؟ (**سەردار فتاح، خەرمانێك...** ، ل12).

**بەدەسکاری کردنی هەر پیتێك یا وشەیەك لە مەتەڵەکە زۆر شتمان لەدەست دەچێت و بۆمان نادۆزرێتەوە، کە دەڵیٚ** ((**دەستی پێوە ئەگریٚ** )) **پیاو بیر لەوە دەکاتەوە کەبۆ پیرۆزی دەستی پێوە بگریٚ یا بۆ ئەوەی نەکەوێت، چونکە لووت سڕین یا کۆکردنەوەی بنێشتە تاڵ بە دەست پێوەگرتن ئەنجام نادرێت.** **بڕوانە ل** 52.

9- (ئەگەر عاقلی، عاقڵ داری خۆت لە بیرە، لە هەموو تەیران چ تەیر بەشیرە)؟ **وەڵام** (**شەمشەمە کوێرە**). ( **خەرمانێك...** ل26)

**چەند ڕێك و ئاوازدارترە کە گوتراوە** ((ئەگەر ئاقڵ داری ئەقڵت بەگیرە، لە ناو مەلاندا کامیان بەشیرە؟)) ( **سەردار فتاح، خەرمانێك**...1977، ل20).

((**گەر ئاقڵداری، ئاقڵت لەبیرە، لە هەموو تەیران کامیان بەشیرە**؟) (**فاتح محمد دەرەبەنی**). ((**ئەقڵدار ئەقڵت لەبیرە، لە تەیران کیهە بە شیرە**)) **عەزیز گەردی**

2- ((**مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی و پەیوەندی بەئەدەب و هونەری تەمومژاوی ئەمڕۆمانەوە**))، ((**چەپکێك مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی**)).

**ناونیشانی ئەم کۆمەڵە مەتەڵەیە کە مـــــــامۆستای هـــێژا ڕۆستەم بـــاجەلان کۆیکردۆتەوە و دابەشی کردووە و لێکۆڵینەوەی لەسەر کـــردووە. سێ جار کۆڕ بۆ ئەم چەپکە مەتەڵە بەستراوە، سێ جارانیش بەچاپ کردن بڵاوکراوەتەوە لە:**

1. **گۆڤاری کاروان ژمارە** (14) **ساڵی** 1983 **کورتەیەکی بڵاوکراوەتەوە.**
2. **فۆلکلۆر،بەشی دووەم- هەولێر،بەغدا،** 1985 **لەلاپەڕە** (28-45).
3. **گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە** 109 **ساڵی** 1986 **لەلاپەڕە** (333-340)

**مامۆستای ڕێزدار زۆر بەدوای کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەیاندا شەکەت بووە، من لە نزیکەوە دەزانم کەوا لە سەرەتای مامۆستایەتیدا لە ناوچەی باڵەکایەتی خولیای ئەم کارە بوو، چەند نـــاوچە و چەند گـــوند گەڕاوە، مـــەتەڵەکانیش فۆلکلۆرین، بەپێی زیرەکیو بۆچوون و شێوەزاری ناوچە و کەسەکان، گۆڕانیان بەسەردا هاتووە،. ئەگەر ئەومامۆستایانەش لەپێش مندا مەتەڵۆکیان کۆنەکردبایەوە و بڵاویان نەکردبایەوە، ئەوا منیش نەم دەتوانی بەسەریان دابچمەوە.**

**زۆربەی مەتەڵەکان، پێش ئەوەی لەلایەن مامۆستا باجەلانەوە بڵاوبکرێنەوە، چەند جـــاری دیکە بڵاوکراونەتەوە، (وەك پێشتر گـــوتومە زۆربەی ئەو بەڕێزانەی مەتەڵیان کۆکردۆتەوە، هاوکارەکانی پێش خۆیان فەرامۆش کردووە وکاری منیش لێرەدا ســـاخکردنەوەی دەقی ئەو مەتەڵانە نیە کە بـــــۆ یەکەمجار بڵاودەکرێنەوە) گەرەکمە کەم و کـــورتی و شێواندنی مەتەلۆکە فـــۆلکلۆرییەکانی مامۆستا بڵاوی کردوونەتەوە بەپێی دەسەڵات و توانای بۆچوونی خۆم، پاش بەراوردکردنیان لەگەڵ دەقی ڕاست و پوخت و گونجاوتر تۆماربکەم و ناتەواویەکانیشیان بەسەرچاوە و بەڵگەی چەسپێنەرەوە بخەینە پێش چاوان:.**

1-((سێ پێ لە بانان دەبەزی، بۆقە و پێت ناڵێم؟))، **وەڵام: بۆق**

(ڕۆشنبیری نویٚ ، ژ 109، ل 338). (فۆلکلۆر، ب2 ، ل40).

بۆقی سیٚ پیٚ یا گیانەوەری سیٚ پیٚ لەسەر هیچ بانیٚکی ئەم ولاٚتەدا نەبینراوە، دەبیٚ پیرەمیٚردی دەست بەگۆچان کرابیٚتە بۆق؟ مەتەلۆکەکە دەلیٚ: ((چوار پیٚی قوتەکە (قوندەکە) لەبانان ڕادەکا، بـــــــۆقە و پیٚت نالیٚم؟)) (زاریٚ مولود عزیز – هەولیٚر) (قوندەکە: بیٚ کلك) هەروەها دەلیٚن ((چواری چەقە، دووی زەقە، بۆقیشە و پیٚت نالیٚم؟). بلاٚوکردنەوەی دەقی فۆلکلۆری بەبیٚ سەرەند و گیٚژکە و بەبیٚ بیٚژینگ و تەتلەکردن، بەبیٚ زیوانشۆر و بژارکردن، بەرهەم بیٚ پیٚزو کرچ و کالٚ و زۆر و بۆر دەکات.

2– ((ئاشەوان دەگەلٚ ژنەکەی، ئاشگیٚڕ دەگەلٚ خوشکەکەی، ئەم چوارەی سەرەوە بۆ شووتی کڕین دەچنە بازاڕی کـــــەرکوك، لە ئەنجامدا تەنیا سیٚ شووتی دەکڕن بەلاٚم ئەوەی جیٚگەی سەرسوڕمانە هەر یەکە و شووتییٚکی وەبەر دەکەویٚت))؟ (وەلاٚم): ژنی ئاشەوان خوشکی ئاشگیٚڕە). (فۆلکلۆر، ب 2، ...ل36).

ئەوەی من بیزانم ئاشگیٚڕ ئاشەوانە، هەر ئاشەوانیشە ئاش دەگیٚڕیٚ، چوار کەسی سەرەوەش نین بەلٚکو سیٚ کەسن، دەقی ئەم مەتەلۆکەیە لە (ڕۆژی کوردستان، ژ63، ل 34) پیٚنج سالٚ پیٚشتر بەم جۆرە بلاٚوکرایتەوە ((ئاشەوان بەخۆی و ژنەکەی، باراش هاڕ بەخۆی و خوشکەکەی، سیٚ کولیٚرەیان هەیە، هەریەکیش کولیٚرەیەکیان بەر ئەکەویٚت؟)) وەلاٚم: (خوشکی باراش هاڕ خیٚزانی ئاشەوانە).

2–((حەلوای سەر بنجی دەخۆی یان گوی میٚرە قنجی؟))
(فۆلکلۆر/ ب2/...ل39)، ( ڕۆشنبیری نویٚ ،ژ 109، ل 338)

ئەم دەقە چەند قنج ترە کە دەلیٚ: ((دەخۆی حەلوای سەر پنجی، یان گوی میٚرووە قنجیٚ؟)) (زرار خدر رەسول، هەولیٚر) لەم دوو دەقەدا تەنها یەك پیت کەم و زیادی تیٚدایە جگە لە گۆڕینی شویٚنی وشەکان، بەلاٚم جیاوازییەکی گەورە لە واتا و لە ڕیٚك و پیٚکیو ناسکی و سەروا وداڕشتنی ئەم دوو تیٚکستەدا هەیە. میٚرە قنج (لە هەردوو سەرچاوەدا نووسراوە) هیچ خزمایەتیو پەیوەندی لەگەلٚ میٚش مەنگوینێدا نییە، بەلاٚن ئاشکرایە کە

هەنگ مێرووێکی خنجیلەی سوودبەخش و خۆشەویستە. بەم شێوەیەش گوتراوە:- ((دەخۆی شەکری سەر پنجیێ، یان گوی قەلاسنجیێ؟)) وەڵام:- حەلوای سەربنجیێ (شەکری سەر پنجیێ) مەبەست گوو سەگە لەسەر پنجی ڕووەك، گوی مێرووە قنجیێ (هەنگ) یا (قەلاّ سنجیێ: کە دیێەکە لە قەدپاڵی چیای سەفین و بە هەنگ بەخێوکردن ناوبانگی دەرکردووە، مەبەست هەنگوینە. وا باوە کە هەنگوین گوی هەنگە، بەڵام ناوەڕۆکی مەتەڵەکە لە ڕووی زانستییەوە ڕاست نییە، چونکە هەنگوین لە قنگی هەنگەوە دەرناچێ، بەڵکو لە دەمییەوە دەردێ و خۆی لە شیلەی ئەم گوڵانەی کە دەیمژێت دروستی دەکات. مەتەڵ هەڵهێنەکە لەکاتی بیرکردنەوەیدا، لە هەڵبژاردنی دوو شت (گوو، حەلوا)، حەلوا (شەکر و شیرنەمەنی) بەشتێکی خۆش و خاوێن دەزانێت، گوی مێرووە قنجی بەناشرین و پیس دەزانێ، لەوانەیە حەلواکە کە دەکاتە گوو سەگەکە هەڵبژێرێت و تێبکەوێت و دەبێتە گەپجاڕی و پێکەنین، ئینجا بۆی دەردەکەوێت کە لە هەڵبژاردنەکەدا تێکەوتووە. پتر بۆ منداڵ و گەلحۆیان دەگوترێت، وەك مەتەڵ هەڵهێنانی تێدا نییە، بەڵکو هەڵبژاردنە و بۆ پێکەنینە.

4-((زەردی زەعفەران، نام لە ووشتران، بردیان بۆ کافران؟)) (ڕۆشنبیری نوێ، ژ109، ل335)، وەڵام: تووتن.

بەڕای من ئەم تێکستە ڕاستترو کوردانە ترە: ((زەردی زەعفەران، باردەکەن لە هێستران، دەیبەنە ناو کافران؟)) یا ((زەردی زەعفەران، نام لە ئێستران، بردم بۆ شاری کافران؟))، ( سەردار فتاح، خەرمانێك...،ل22)

پاش دۆزینەوەی جیهانی نوێ (کێشوەری ئەمەریکا) لەلایەن کۆلۆمبسەوە، تووتن بە هۆی گەمیەوان و گەڕیدەکان بڵاوبوویتەوە، لەوڵاتی ئێمەشدا چاندن و بەکارهێنانی تووتن (دواتریش تەماتە و پەتاتە کە لە خێزانی ڕووەکی باینجانییەکانە (solaneceae)، ڕابردووێکی کۆنی نییە، تا سەردەمی (سوڵتان مرادی چوارەم - سوڵتانی عوسمانی) تووتن وەك تریاك و هیرۆین و حەشیشە و بەنگی ئێستا سەیر دەکرا، هەر کەسێك جگەرەی بکێشابوایە، فەرمانی کوشتنی

درابوو، بەلاّم لە سەردەمی سولّتان سەلیمی دووەم دا فەرمانەکە هەلّگیراو باج لەسەر تووتن و توتن چاندن داندرا، لەو کاتەشەوە تاکو ئێستا کەوشەنی کوردستان لەو شوێنانە نەبووە کە وشتر بار هەلّگری سەرەکی کاروانچییەتی و بازرگانییەتی بووبێت، تا تووتن بۆ کەنار دەریا و کارگەکانی جگەرە بگوێزرێتەوە ئەوروپا. وشتر کە بارهەلّگرێکی چاکە و بەرگەی تێنویەتی و برسیەتی و گەرما دەگرێت، لە بیابان و دەشتە پانەکاندا هۆی گواستنەوەی خویّ و خورما و... بووە، بەلاّم ئەم بەستەزمانە کەلەش زل و پیّپانە لەگەلّ ناوچەی سارد و شاخاویدا کە جێگەی بەرهەم هێنانی تووتنە ناگونجێت. لە کوردستانی عێراق دا خەلّکی بەدەگمەن وشتریان دیوە، لە کوردستانی گەورەش دا وشتر کەمتر هەبووە، هۆی گواستنەوەی سەرەکی لە ناوچە شاخاویەکاندا هێسترە، کە ولاّخێکی دوو ڕەگی نەزۆکە، چونکە لە دوو جۆری جیاوازدا پەیدا بووە، هێزی ماین و ئارامی نێرەکەری تێدا کۆکراوەتەوە، زانایانی ئاژەلّناس بەپێی بەلّگە مێژووییەکان لەم باوەڕەدان کە بۆ یەکەم جار هێستر لە کوردستان دا بەپەڕینی نێرەکەر لە ماین داکەوتووە (هەر وەك شوێنەوارە دێرینەکانی: ئەشکەوتی شانەدەر و هەزارمێرد و پەیکەری مرۆی لیاندڕتال و گوندی چەرمۆ وشوێنەواری کۆنینەی گەنم چاندن و ئاژەلّداری و چەندین بەلّگەنامەی دیکەش دەیچەسپێنن کە سەرەتای کشتوکالّ و گوند نشینی لەم دەڤەرە سەریهەلّداوە) هێستر کە ئاژەلّێکی نەزۆکە بۆیە هەر لەم ڕوانگەوە مەتەلّەکی دیکە هەیە دەلّێت ((نەچاندی لە نەزای بکە، نەزای لە نەنووستی بدەی؟)) خۆیّ ناچێندرێت لە هێستر باربکرێت هێستری بالّەبانیش کە نازێت لە ئاوی ڕووبـاری بپەڕێنێتەوە کە ئـــاوەکەی هەردەم لە ڕۆیشتن دایە و نـــاخەوێت. پـــاساوێکیش بـــۆ مـــامۆستا دەینینەوە و دەلّێین کە مـــەتەلّەکەی مـــامۆستا بـــــاجەلان لەلایەن (بڕەك ئەیبوبیان لە سالّی 1982 لە هەتەلّەکەی کوردی لە ل14) بەم شێوەیە بلاّو کرابۆوە. ((زەردی زەعفەران، نایان لە وشتران، بردیان بۆ گاوران؟)).

**5-((چوومە سەر دارەکی، سەد سینگم بڕی بەجارەکی، یەکم وە دایێدا، یەکم لە کایێ کوتا؟))، (ڕۆشنبیری نوێ، ژ 109، ل 336).**

**کـــوانێ (98) سینگەکەی مـــاوەتەوە؟ ڕاست و ڕەوانترە کە دەلێن:** ((چوومە ناو دارو بارەکی، چوار سنگم بڕین بەجارەکی، دووم کوتا کایێ، دووم دا دایێ)).

**ئەمانە لە کۆڕی مەتەڵ هەڵهێنان دەگوترێن، بەڵام هەڵهێنانی تێدا نییە، بەڵکو جۆرە پێشبڕکێیەکی لێك نزیك بوونەوەی وشەکان و پیتەکانن، کە زمان ڕەوانی و دەمڕاستی و زیرەکی تێدا بەدیار دەکەوێت. هەروەك دەڵێن** ((میوانەکەمان هات، دایکم نۆ نانی دایێ، نۆ گای دایێ)) **بە دووبارە و سێـــبارە کردنەوەی دەقەکە بەخێرایی، تەتەڵە و زەللەی زمان پەیدا دەبێت و لە کابرا و لە دایکی کابرا دەقەومێ، دانیشتووەکانیش بە تێکەوتن و هەڵەکردنەکە تێر پێکەنین دەبن و دەبێتە گاڵتە و گەپێکی خۆش و کات بەڕێ کردن.**

**6-((گەنمە نێریەکی پرچن پرچن ,هەر پرچم گرت و لێ ی هەلاٌتم ,پرچی گرتم** و لێی هەلاٌتم )). **(ڕۆشنبیری نوێ، ل326). (فۆلکلۆر، ب 2، ل34).**

**لە هەردووکیاندا (گەنمە) نووسراوە بۆیە ناکرێت بەهەڵەی چاپ دابندرێت, من ئەم دەقەم ئەوها بیستووە** ((گـــەیشتمە نێریەکی پرچن, هـــەر پرچم گرت و هەڵیهاتمێ, هەرپرچم بەرداو هـــەڵی هـــاتمێ)). **ئەمەشیان دەچێتەوە بابەتی پێشبڕکێیەکەی کە پێشتر باسمان کرد. تێبینیم لەسەر دەقەکەی مامۆستا: (گەنمە) نیٚیە، بەڵکو گەیمە (گەیشتمە)یە، (پرچی گرتم) نییە (پرچم گرت)ە چونکە نێری واتە (تەگە) پرچی مرۆ ناگرێت، ( لیێی هەلاٌتم) نییە و (هەڵی هاتمێ)یە چونکە مەبەست سوار بوونە، تەگەش(نێری) سواری بزن دەبێت! هەتەڵە نییە و تەتەڵە کردنی زمانە.**

**7- (مەیلەکم هەیە مەیلانە، لەناو بوخچەی سوڵتانە، لەبۆ ڕۆژی تەنگانە) وەڵام: منداڵە لەناو سکی دایکیدا. (ڕۆشنبیری نوێ ژ 109، ل 340)**

**مەتەڵەکە پێشتر چەند جار بڵاوکرایتەوە کە دەقەکانیان بەپێزتر و پڕ واتاترن، بۆ نموونە:** ((**چتێکم هەیە لە چتانە، وا لە بوخچەی سوڵتانە، خوا نەبێ هیچ کەس**

نەزانە؟)) (ڕۆژی کوردستان، ژ 63، ل 37). ((چ شتێك هەیە چشتانی، لەناو بوخچەی سوڵتانی، خودا نەبی کەس نایزانی؟)) (ڕۆشنبیری نویٚ ژ94، ل 79 و چەند باسێکی ئەدەبی ل 27). ((مەیلەکم هەیە مەیلانی لەناو بوخچەی سوبحانی، خودا نەبی کەس نایزانی؟)). (فاتح حاجی محەمەد دارەبەنی).

منداڵ کە لەنـــاو سکی دایکیەتی سگەکە بە بـوخچەی خـــودا داندراوە، تەنها خوداش لەکاتی دروست بوونی منداڵەکە دەزانێت نێرە یان مێیە، بەڵام منداڵ لە ناو سگی دایکی دانا‌ندرێت بۆ ڕۆژی تەنگانە، وەك پارەی سپی لەناو خەزێنەدا بۆ ڕۆژی ڕەش بێت و ئەوکاتەی بتەوێت دەری کەی.

8-((پیاوی یان میاوی؟)) (فۆلکلۆر، ب 2، ل40)، (ڕۆشنبیری نویٚ، ژ 109، ل 338

9- ((خوشکی یان مشکی؟)) (فۆلکلۆر، ب2 ، ل 40).

لەگەڵ مەتەڵدا نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە، ئەگەر ئەمانە مەتەڵ بن ((سەرمایە یان گەرمایە، هەڵبژاردنی تێدایە، زۆر جۆرە مەتەڵی دیکەش دێتە کایە)).

10- ئەگەر (فڕی فڕی و فڕی فڕی قەل فڕی) ڕۆشنبیری نویٚ، ل340. جۆرێك بیٚ لە مەتەڵ ئەوا (چاوشارکیٚ و خەجەڕۆ پینە و پەڕۆ)ش دەبنە مەتەڵ ئەوانیش یاری منداڵانن. خۆ خلە لەبلەی کەمتر نییە. فڕی فڕی قەل فڕی گەمەیەکی منداڵانەیە و خوالێخۆشبوو مەلا محەمەدی کۆیی نووسیویە و بەهەشتی گیو موکریانی چاپی کردبوو و مامۆستا محەمەد کەریم شەریف دووبارە لە (فـــۆلکلۆری یارییەکانی کوردەواری، ل 117-118)دا لەسەری نووسیووەتەوە.)

11- (هەولێر... ئەتۆ ڕێوی ئەمن شێر) (ڕۆشنبیری نویٚ ، ل339).

12- (باژێڕ... ئەتۆ پاقڕ ئەمن زێڕ). (ڕۆشنبیری نویٚ ، ل339).

13- (ڕیٚ... ئەتۆ جۆگە ئەمن زیٚ). (ڕۆشنبیری نویٚ ،ل339).

14 (یەك دەم.. دوو دەم.. بەسەر دەیان دا پاز دەدەم).

هەڵهێنان و بـــــیرکردنەوەیان تێدا نییە، پەیوەندی و خزمایەتی دوور و نزیکیان لەگەڵ هیچ جۆرە مەتەڵێك دا نییە، چیرۆکی(( کۆسە کۆسانێ و...بڵێ جوو، لە کیست چوو...))ش جۆرێکن لەم مەتەڵە تازە بابەتانە. هەر وەها دووبارە کرنەوەی سەلم کی،(کە دەبێتە کیسەڵم و) ڕۆشنبیری نوێ، ل 339، کە لە ژێر جۆرە مەتەڵی شەشەمی داناوە، هەمان بابەتی سەرەوەیە و بە مەتەڵ دانادرێت.

مامۆستا دەفەرموێ: ((لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و ورد و زانستییانەم کردووە)) منیش دەڵێم تەنها بۆ بڵاوکردنەوە یەك مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی گەر بڵێین ئێمە بڵاوی دەکەینەوە، نەك لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل، پێویستە سەربەسەر هەموو ئەم سەرچاوانە دابگرین کە پەیوەندیان بەمەتەڵی فۆلکلۆری کوردییەوە هەیە، سەرەڕای سەرچاوەکانی زانستی فۆلکلۆر بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام مامۆستا نە پەنجەی بۆ ڕاکێشاون و نەبەکاریشی هێناون.

15- مامۆستا دابەش کردنی مەتەڵی کردووتە دووبەش.

بەشی یەکەم بۆ پێنج جۆر و بەشی دووەمیش بۆ دە جۆر، بە بۆچوونی من دابەش کردنیان بـــەپێی بــــابەت و خــــزمایەتی و نزیکایەتی مەتەڵەکان لەگەڵ یەکـــتریدا، لێکۆڵینەوەکە سەرکەوتووتر دەکات و تێکەڵاو کردن و شێواندنی دەقەکانیش کەمتر دەکـــاتەوە، بەراوردکردنیان ئـــــاسانتر دەبێت و بـــاری ئــــــابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و زیرەکی و بیروباوەڕی میللەتەکەش ڕوونتر دەنوێنن.

16- نموونە هێنانەوەشی بۆ هەر جۆرێك لە جۆرەکانی کە مامۆستا دابەشی کردووە، هەندێکیان لەگەڵ دابەش کـــردنەکەدا ناگونجێن. مـــامۆستا زۆر دەقی پوخت و بایەخداری لەبەردەست دا نـــەبووە تـــا بیانکـــاتە دەسکەلا، وەك ئەو نموونانەی خوارەوە کە مشتێکن لەم خەراوەرەدا:

أ-((مەیلەکم هەیە مەیلانە، لەناو بوخچەی سوڵتانە، لەبۆ ڕۆژی تەنگانە)).

لەگەڵ مەیل مەیلانێی جۆری نۆیەم ناگونجیٚ، مەیل مەیلانی وانییە. لە ((فۆلکلۆری یاریەکانی کـــوردەواری، محمد کریم شریف، ل132)) دا  مەیل مەیلانیٚ بەدریـــژی باســـکراوە، منیش دەمەوێت کورت بـــڕی بکەم و دووبارە درێژی نەکەمەوە، تەنیا هەبوونی وشەی (مەیل) کە بەواتای مەتەڵیش دێت ڕەوا نییە مەتەڵەکە بخەینە خانەی گەمەی مەیل مەیلانیٚ.

ب- هەردوو مەتەڵە عەرەبییەکەی (ل366و ل337)ی ڕۆشنبیری نویٚ: .

((ما معنى هذه الحزورة: يا قاضي تها، أسألك عن امرأة تزوجتها، فهي أمي وأنا ولدتها،)) و ((أبن وأبن أمي , وأنا بنت باكرة))

دەکەونە بەر یەك جۆر و لە یەکدی جیا ناکرێنەوە.

ج- مەتەڵەکەی مـــەلا مەســـعودی بیٚبـــەش (هەڵهێنێك ئـــەڵێم لە شەش پیتانە، دەرئەچیٚ هەرمانگ لەم کوردستانە، پتی یەك و دوو بەچوار پیٚ ئەدریٚ، وا ئەبیٚ کاری دیشی پیٚ ئەکریٚ...هتد) وەڵام گۆڤاری (کاروان)ە.

ناچێتە سەر ئەدەبی تەمو مژاوی سەردەم، بەڵکو مەتەڵێکی رووتی نووسراوی سەردەمە، خوالێخۆشبووان: مامۆستایان نەجـــمەدین مەلا و زیوەر و گۆران و بێکەس و کاردۆخی و ... لە کۆنەوە زۆریان  لەم بابەتە مەتەلأنە نووسیوە،  نموونە:- لە لاپەڕە دووی رۆژنامەی ژین ژمارە (555)دا کە لە شوباتی ساڵی 1939ز  دەرچووە مەتەڵێکی مەلانەجمەدین نوسراوە کە دەڵیٚ:- ((مەتەڵەکەمان پارچەییێکە لە خاکی سلێمانی، شەش پیتە، سێیانیان باڵندەییێکە هەمیشە بەسەر دەستی شاهانەوەبووە و هەڵفڕیوە تەقڵەیەکی لێداوە و وەرگەڕاوە، هەر لەو نزیکانە بووەتە روبارێکی مەزن، پارچەی چوارەمی ناوەتە ژێرخۆی کردوویە بە یاری، ئەو باڵندەیە دوایی پارچەی مەتەڵەکەی  کردوتە دەستی  بۆی بووە بە پارچەیەك خشڵ ،  1 و 3 و 6 بۆت هاتووتە شیر، سیٚ پیتی دوایی سەرەو ژێر لێدە دەنگێکی خۆش ئەبیٚ)) وەڵام (بازیان) لە لاپەڕە دووی ژمارە (556)ی  هەمان رۆژنامە مەتەڵێکی دیکەی لەم بابەتە بەناوی مامۆستای نەمر زیوەر بڵاوکرایتەوە.لە نێو دیـــوانی شـــاعیرەکانیشمانا نموونە زۆرن، بەڵام ئەمانە مەبەستی ئێمە نین.

د- بەڕای من ناوەڕۆکی بابەتەکە ((مەتەڵی فـــــۆلکلۆری کـــوردیو پەیوەندی بەئەدەب و هــــونەری تـــەمومژاوی ئەمڕۆمانەوە)) کـــــەم و زۆر نیشانەی ناوونیشانی نەپێکاوە، **زۆریشی کــــــورت کـردووە، ئەگەر چی تەم و مژ و هیما  لە ئەدەب دا شتێکە و (چـــەندین مەبەستی تایبەتی خــــۆی هەیە، کە پەیوەندی بە کارەکەی ئێمەوە نییە)، مەتەڵیش شتێکی دیکەیە.**

## 2- کۆمەڵێك مەتەڵی كوردی

ناونیشانی کـۆمەڵە مـــەتەڵێکە کە مامۆستای بــــەرێز محمدی مەلا کریم کۆیکردوونەتەوە و پێشەکی بۆ نووسین و لێکدانەوەی بۆ کردوون و لە لاپەڕە 34-42ی ژمارە(163)ی گۆڤاری رۆژی کوردستان، ساڵی1981بلاوکراونەتەوە.

بە بڕوای من ئەم کۆمەڵە مەتەڵەی مامۆستای بەڕێز کە 97 مەتەڵی جۆراوجۆرن و بەپێی ئەبجەدیەتی پیتی سەرەتایان ریزیکردوون، جوانترین و نایابترین کۆمەڵە مەتەڵن بلاوکرابنەوە و باشترین لێکدانەوەشیان بۆ کراوە.

**ئەم سەرنجانەی خوارەوەم دەربارەی مەتەڵەکان هەیە:**

1-(( بەژنی باریك شەوی تاریك)) وەڵامەکەی تفەنگە. مەتەڵی ژمارە 14 لە ل 36

من وادەزانم نیوەی دووەمی مەتەڵکە: ((خۆم ناوێرم تۆ دەنێرم )) ی کەوتووە، چونکە تفەنگ بـــۆ فیشەك تەقاندن وگوللە هاوێشتن بەکــاردێت و گوللەکەش دەنێردرێتە شوێنی ترسناك کە خاوەن تفەنگ خۆی ناوێرێت بچێتە ئەویٚ.ئەگەرنا مەتەڵەکە بۆ کچێکی بەژن باریك بە شەوێکی تاریك دەشیٚ.

2-(( خوا نەیکردووە)) ( نەی، قامیش) مەتەڵی ژمارە 40 ل 38.

ئەویش نیوەی دووەمی(و هەیە) کەوتووە، پێشتر مامۆستای نەمر علاءالدین سجادی لە دەقەکانی ئەدەبی کوردی ل 166 دا بلاوی کردۆتەوە و دەڵیٚ[1]: ((خوا نەی ناوە و هەس!))

3-: (( دەشتێکە و دووکانێکە، چوار مەڕو شوانێکە؟)) مەتەڵی ژمارە 47،ل 38 و ((سەربانێکە و بن بانێك چــــوار مەڕە وشوانێکە)) مەتەڵی ژمارە 55، ل39 وەڵام دەست. وا دەزانم دوو تیکستی یەك مەتەڵن.

---

1- - لە بەرگی گۆڤارەکە نووسراوە ژمارە 63، کەچی لە پێرستی ناوەرۆکی بەشە کوردییەکەی نووسراوە ژمارە 60 !.

4- **هەروەها مەتەڵی ژمارە 44،ل38** (( دوانت لێ هەڵکێشم، دوانت لێ راکێشم، ، بە وشکی تێت ئەخەم، بە تەڕی لێت دەرکێشم؟)) **و مەتەڵی ژمارە 96،ل42** ((یەکی لەپشتی، دووی پێوە شـــۆڕ ئەبێتەوە، بە وشـــکی تێیدەنێن، بە تەڕی دێتە دەرێ؟))، **(وەڵام لغـــاو و زین) دەکـــرا بکرینە دووتێکستی یەك مـــەتەڵ، پێشتر نووسیوومە کە دەقی مەتەڵەکە جوانتر و تەواوترە کە دەڵێن : (( یەکی لێ دەکەم "1"، یەکی لەبن زگی ڕادەکەم (2)، یەکی لەبن کلکی دەنێم (3) دووی پێوە دەکەم (4)، دووی لێوە دەکەم (5) دووی بەسەر قوزێدا شۆڕدەکەمەوە، بەهیشکی تێی دەنێم، بەتەڕی دەری دێنمەوە (7) ؟)) وەڵام (1) یەك زین لە ئەسپ دەکرێت. (2) تەنگە کێش (تەنگەبەند) (3) قوشقونە (پارو، ژێرکلکە). (4) رکێب (ئاوەزەنگ)، (5) ڕێشمەو دەسجڵەو، (6) گوڵنگەی پاشکۆی زین، (7) لغاو. (لە حاجی محمد سلیمان شێخ بزێنی، ڕاوچی، وەرگیراوە) .**

5- (( لووتەی لە ماڵ تۆراو )) مەتەڵی ژمارە 75، ل 40: **وەڵام مێخی دەوار ، چونکە دەوار لە دەرەوەی ماڵ هەڵئەدرێ.**

**من وای بۆ دەچم کە مەبەستیان بێت سینگی داوی هەڵدانی رەشماڵەکە لە دەرەوەی دەوارەکەیە، نەك دەوار لە دەروەی ئاواییە.**

6 – مەتەڵی ژمارە 85، ل 41 : (( مەلێ هات بە سیسی ئیسا لە موسای پرسی، ئەو مەلە بۆ رۆیی بە برسی؟))
**وەڵام مەل بە مردووشوبهێنراوە.**

**من وام بیستووە و واشی بۆ دەچم کە مەبەست لە مەتەڵەکە مانگی رەمەزان بێت ،چونکە بۆنی ئاینی دەدات و برسیەتی و سیس بونی مرۆی برسی لە رمەزانا دێنێتە بەرچاو، لە زۆر مەتەڵی دیکەشدا مانگی رەمەزانیان بە تەیر شوبهاندووە.((تەیرێك هات بە هانەهان، دندووك سپی شاقاڵ کەوان،گەورەی گرتن، گچکەی بەردان.))،**
((مەلێك هات بە هانە هان، شاپەڕ سپی تیر و کەوان، عیسا لە موسای پرسی، ئەو مەلە بۆ رۆیی بەبرسی؟)) لە ئاسۆی زانکۆ، ژ 2، ساڵی 1980 بلاوکرایتەوە

7- مەتەڵی ژمارە 89 ل 41 (( هەر لە بەیانی تا ئێوارە خۆڵ ئەکا بەسەر خۆیا، ئێوارە دێتەوە لە ئاغەژنەکەی خـــۆی جوانترە)). ((وەڵام گـاسن، مەبەست لە ئاغەژنەکەی ئێرەقەکەیە کەلێی گیرکراوە، خزمەتکاری بۆ ئەو ئەکا و زەوی بۆ هەڵ ئەگێڕێتەوە، بۆیە لێی جوانترە، چونکە ئەم ئاسنە و ئەو دارە.))

من وادەزانم ئاغەژنەکە کەیبانوی ماڵی خاوەن جووت وگاسنەکەیە، چونکە جوتیار یا رەنجبەر بە خاوەن کارەکەی خۆیان دەگوت (ئاغا) لە لایەکی دیکەشەوە لە دەقەکەدا دەڵی (( ئێوارە دێتەوە))ماڵی ئاغا، بۆیەش گاسنەکە جوانترە، چونکە ئەو کانزایە ئەوەندەی لەگڵ بخشێت، لـــووس و بـــریسکەدار دەبێ. ناکرێت زمانەی ئاموورەکە (هەوجاڕ، ئێلەقە) بە ژن دابندرێت چونکە گاسنەکە گەرۆمەی هەیە و زمانەکەش لە گاسنەکە رادەکرێت.

دەڵێن قسە قسەی رادەکێشی، بۆیە ئەگەر درێژ دادڕیبکەین و لە چەقی بابەتەکە دوور بکەوینەوە بەڵام لە جغـــزەکەی دەرنەچین: دەڵێن پیشەگەری میللی وەك: ئاسنگەری و زێڕینگەری و بیناسازی و دارتاشی و داو ودەرمانی کوردەواری... لە ئیمارەتی سۆران- رواندز زۆر باوی هەبووە، تۆپەکەی وەستا رەجەبیش باشترین بەڵگەیە، پێشتریش لە دەڤەرەکەدا وا بـاوبوو کە جــــوتیار رۆژانە ئاموورى لە کێڵگەکەیدا بەجێدەهێشت، لە سەردەمی پاشای گەورەدا هەوجاڕدز پەیدابوون و جوتیارەکان لە ترسی دزان رۆژانە ئامووریيان دەبردە سەرکار و ئێوارە دەیانهێناوە، هەراسان ببون، ســـکاڵایان لەلای پـــاشا دەربڕی، ئەویش رۆژێك فەرمانیدا: هەمو پیاوانی ناوچەکە لە سەر لێواری خەرەند کۆبکەنەوە، خۆی لە شوێنێکی بەرز رووەو حەشاماتەکە وەستاو قسەی بۆ دەکردن لە هیکەوە گوتی ((کورە کابرای شان بەقوڕ ئەوە لۆ ئاموران ئەدزی)) کابرای دزەش بێدەستی خۆی ئاوڕی بۆ هەردوو لاشانی داوە و دەستی پێداهێنا.ئیتر دزە ئاشکرابوو و چارەیان کرد و لەو رۆژەوە ئاموورى لەسەر زەویێ بەجێدێلن و نایهێننەوە.

ئەگەر مەتەڵەکانی مامۆستا کۆی کردوونەتەوە لەگەڵ مەتەڵەکانی بەرێزان :

**سەردار فەتاح** (1977) **خەرمانێك لە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی. و فخرالدین رۆوف** (1978) **چەپكێك لە مـــەتەڵی فـــۆلكلۆری كوردی بەراورد بكرێن كە دوو نامیلكەی تایبەتن بە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی و پێشتریش بڵاو كراینەوە ، ئەوا مەتەڵەكانی مامۆستای بەرێز دەبنە مێوژی سەر بووكێ، بەڵام ئێمە تەنها لەگەڵ دوو سەرچاوە بەراوردیان دەكەین كە  تایبەت نین بە مەتەڵ و دووكتێبی زۆر دیارن ناكرێت بڵێین مامۆستای رێزدار نەیدیون :**

1- **عیزەدین مستەفا رەسوول** (1979) **لێكۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی  چ** 2، **ل** 210- 213 . **كە چاپی یەكەمی لەساڵی  دا بڵاوكرایتەوە**1970.
2- **علاءالدین سجادی** (978) **دەقەكانی ئەدەبی كوردی  ل** 163-167.
**لە سەرچاوەی یكەم دا سێ  مەتەڵ و لە دووەمدا** (14) **مەتەڵ بڵاو كرایتەوە.**

1- ((سایەقەی سامالْ هەوری فەرەنگی، دوو ئاو لە جامێ هەریەك لە رەنگێ؟)). **رۆژی كوردستان**، ژ63،ل39).**پێشتریش لەم سەرچاوانەی خوارەوە بڵاوكرایتەوە**

ا- (**د.عیزەدین مستەفا رەسول**(1979) ،**ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، چ** 2، **ل** 212

ب- (**جەمال بابان،گۆڤاری پەروەردە و زانست، ژمارە** 1،**ساڵی**1971).

ج- (**سەرنجێك لە دەروازەی فۆلكلۆری كوردی، نەقابەی مامۆستایان**، 1961، ل25).

2- (( بەقەد پوولێكە، پڕ بە ژوورێكە ؟)).**گوڵی چرا** (**رۆژی كوردستان**...**ل** 36)
(( بەقەد پوولێكە، پڕ بە ژوورێكە ؟)).( **عیزەدین**...**لێكۆڵینەوەی** ...**ل**210)

3-((**بیگرە پڕ بە مشتێكە، بەری‌دەی پڕ بە دەشتێكە؟**)). (**رۆژی كوردستان**...**ل** 36).

((بیگرە مشتێكە، بەری‌دە دەشتێكە)) **چرا** ( **سجادی**...**دەقەكانی**...**ل** 164.)

4- (( تەپ لەسەر تەپ، دەستت لە رەپ.)).**دەستاڕ** (**رۆژی كوردستان**...**ل** 37

(( تەپ لەسەر تەپ, دەستت لە رەپ؟)) ( **سجادی... دەقەکانی... ل** 165.)

5- (( هێسترە شەشەم، شەش پا و دوو دەم، ماڵیان لە چەم، بێترس و خەم؟)) (**ڕۆژی کوردستان...ل** 41)

((شەش پا و دوو دەم، ماڵی ها لە چەم ؟)) (**سجادی...دەقەکانی. ل** 16.)

6-((سەری یەکە و بنی دوو، بــە قنگی بــاو و باپیرتا چوو؟))(**ڕۆژی کوردستان، ژ** 63، **ل** 39)

((هەڵئەچێو دا ئەچێ، بەقنگی باو و باپیرتا ئەچی؟)) (**ڕۆژی کوردستان...ل** 41)

((لە سەرەوە یەك، لە بنەوە دوو، بە قنگی باو و باپیرتا چوو؟))

(**سجادی... دەقەکانی... ل** 166.)

**هەرگیز مەبەستم نییە بڵێم: _ ئەگەر یەکێك دەقێکی بڵاوکردەوە ئەوا کەسیدیکە مافی چاپکردنەوەی نەبێت، بەڵام دەڵێم ئەگەر بەراورد بکرێت و ئاماژەش بۆ سەرچاوە چاپکراوەکان بکرێت، ئەوا ماندووبوونی هاوپیشەکانمان فەرامۆش ناکەین و کۆششی هەردوولایانیش دەنوێنێت، لە لایەکی دیکەشەوە کەموکورتی دەقەکان زەقتر دەردەکەون و باشتریش کەلێن و درزەکان چارە دەکرێن، پتریش شێوەی زانستی و ئەکادیمیانە پەیرەو دەکەین ... مەبەستی من لێرەدا هەموو ئەو بەڕێزانەیە کەدەق کۆدەکەنەوە و تۆماری دەکەن. زۆر بەئاشکرا دیارە کە زۆر لەو بەڕێزانەی مەتەڵیان کۆکردۆتەوە و چاپیان کردووە، لە زۆر شوێندا سوودیان لە چاپکراوەکانی پێشەخۆیان وەرگرتووە و بە دەگمەنیش ئاماژەیان بۆ دەکەن، بەم کردارەش نەك هەر بەرهەمەکانیان ڕەسەن و بەپێزتر نابێت بەڵکو بە پێچەوانەش دەکەوێتەوە.**

## تێبینی و روونکردنەوە

1 – لەبەشەکانی پێشتردا مەبەستمان لێکۆڵینەوە و راستکردنەوە بـــوو، بۆیە لە هەموویاندا وەك بابەتە ئەکادیمییەکان ناوی سەرچاوەکانمان تۆمارکردووە. بەڵام لێرە بە دواوە وەکو پێشتر ئاماژە بۆ سەرچاوە چاپکراوەکان و ئەو کەسانە ناکەین کە مەتەڵەکانمان لێ وەرگرتوون، چـــونکە زۆربەی مەتەڵەکان لە چەندین گـــۆڤار و کتێبدا بەشێواز و دەقی جۆراوجۆر بڵاوکراونەتەوە، ئێمەش بە بۆچوونی خۆمان پوخت و رەوان و گونجاوەکانمان هەڵبژاردوون و لە گەلێك شوێنیشدا بە هۆی مەتەڵزانانەوە کەم و کورتییەکانمان چارەکردوون و چەندین مەتەڵیش بۆ یەکەم جار چاپدەکرێن، خۆ ئەگەر لە گشت شوێنێکا وەك تۆژینەوە ئاماژە بە هەموو ئەو سەرچاوانە بکەین (تەنها هەرمەتەڵێك لە چـەندین چـاپکراودا بڵاوکرابێتەوە و هەندێك جـــار هـــەمان دەقە و لە هەندێك شوێنیشدا کـــەمێك جیاوازیان هەیە) ئەوا خوێنەر زۆر زوو زوو لە دەقەکان دادەبڕێت کە رەنگە بێزاربێت، لەلایەکی دیکەشەوە هەر ناوی ئەم سەرچاوانەیە کە دەبێ دەیان و سەدان و... جار بیان نووسینەوە، لە ئەنجامیشدا کتێبەکە ئەوەندە گەورە دەبێت رەنگە نەتوانم چاپی بکەم، بۆیە لە کۆتایی کتێبەکە هەر وەك زۆربەی چاپکراوەکان، بەشێوەیەکی گشتی ئاماژە بە گشت ئەو سەرچاوانە دەکەم کە سوودم لێوەرگرتوون.

2– لە کاتی پاکنووسکردنەوەی کتێبەکە ســـێ چـوار ســـەرچاوەم لەبەردەستدا نەمابوون و چـــەندین جـــــاریش رەشنووسەکە بە دەسنووسی چەند کەسێك نووسراونەتەوە، سەرەڕای هـــــەڵەی کۆمپیوتەر، بە ئاشکراش لە دەقی هەندێك مەتەڵدا تێکەڵاوکردنی شێوەزارەکانیان تێدا بەدیدەکرێت، بۆیە دوورنییە هەندێك هەڵەی بە نەکاوی و نائەنقەست روویدابێت، یا لە سەرچاوەکانی پێش کتێبەکەی من بە هەڵەی نووسیویانن یا مەتەڵبێژەکان بە تێکەڵاوی ناتەواوی و گوتوویانن.

**بۆیە  هێشتا لە هەندێك دەقدا کەموکورتی و ناتەوای بەئاشکرا بەرچاو دەکەون و بـــۆمان چارە نەکــراون و بۆخۆشمان بە راستمان نەزانیوە دەستکاریان بکەین) ئەمانەش پاساوهێنانەوە نین، بەڵکو ئەمانەتێکی زانستییە، دەبێ پێی لێ بنێین، پێ لە هەڵەنانیش پتر گەورەیی و دەسپاکی دەنۆوێنێ، شاردنەوەی راستییەکانیش بێتوانایی و نەزانی و... دەردەخەن.**

**لە سەرچاوەکاندا ئاماژەمان پێکردووە کە لە زۆر ناوچاندا خۆم راستەو خۆ لە دەمی خەڵك دەقەکانم وەرگرتووە، بەڵام لە زۆر نـــاوچانیشدا دڵـــسۆزان لە خەڵکیتر کۆیانکردۆتەوە و بۆیان ناردووم.**

## پۆلینکردن و دابەشکردنی مەتەڵەکان بەپێی بابەتکانیان : ـ

دەقی مەتەڵەکانم بە گوێرەی پەیوەندی ناوەرۆکەکانیانەوە پۆلین کردووە، نەك بەپێی ئـەبجەدیەیی پیتی دەسپێکردنیان، چونکە وادەزانم ئەگەر بە پێی پیتی ســــەرەتای مــەتەڵەکان ریزبکرێن، ئەوا دەبێت دەق و ناوەرۆکی یــەك مــەتەڵ گــەلێك جــار دووبارە بکرێنەوە (هەرچەندە بەپێی ناوەرۆکیش دەقی هەندێك مەتەڵ چەند بابەتێکی جیای گرتۆتە خۆ، بۆیە هەندێکیان دووبارە کردنەوەیان گەرەکە، بەڵام گەلێك کەمـــترە گەر لەگەڵ ریـــزکردن بە پێی پیت بەراورد بکرێت.) بـــۆ نـموونە: کە مەتەڵێك لە دەوروبەری هـــــەولێر بە **(دە)** دەسپێدەکا، هەمان مەتەڵ لە نـــاوچەی ســـلێمانی سەرەتاکەی ئەبێتە **(ئـە)**، لەوانەیە لە دەڤەری دهۆکیش پێشگرێکی وەك: (مامکێ منۆ) ی بخرێتە پێش، یا مەتەڵێك لە یەك ناوچەدا سەرەتای مەتەڵەکە **(شتێکم هەیە)**،**(تشتێکم هەیە)**، **(چشتێکم هەیە)**، **(ئەشتێکم هەیە)** بێت! یا هەر مەتەڵێك لە سەرەتادا چەندین پێشگری بۆ داندراوە.

هەر چەندە لە سەرەتا یا کۆتایی هەر مەتەڵێکدا دەبێ ئامرازی پرسیار هەبێت، بەڵام بەزۆری بەهۆی کورتبڕییەوە وەلاندراوە.

پۆلین کردنی مەتەڵ بە پێی بابەت و ناوەرۆك، بیرکردنەوە لە هەڵهێنان و هەڵسەنگاندنیان ئاسانتر دەکات و رەوانی و جوانکاری دەقەکانیشیان روونتر دەخاتە بەرچاوان. پۆلینکردنی مەتەڵان بەپێی بابەتەکانیا زۆر ئاڵۆزە و ئاسانیش نییە، چونکە هەر چۆنێکیان پۆلین بکەین هەر ناتوانین چەندین پێوەری سنووردار دیاری بکەین بۆ ئەوەی بابەتەکان تێکەڵی یەکتر نەبنەوە، هەر چۆنێك بێ، مەبەستمان ئاسانکاری و قووڵبوونەوە و کورتبڕییە.

ریزکردنی مەتەڵ بە پێی پیت، کارەکە ئاسانترە و دۆزینەی دەقەکانیش ساناتردەکات، بــــەڵام لە هەمان کاتدا بیرکردنەوە لە چۆنیەتی دارشتن و هەڵهێنانی مەتەڵەکان فەرامۆش دەکات، چونکە دابڕ دابڕێکی زۆری تێدەکەوێت کە ئەمەیان گرنگیەکی تایبەتی هەیە.

## پۆلین کردنی مەتەڵ بە پێی بابەت و ناوەرۆك:-

**یەکەم : ـ مەتەڵی تایبەت بە ئاین:ـ**
**دووەم : ـ مەتەڵی تایبەت بە سروشت:**
**سێیەم : ـ مەتەڵی تایبەت بە مرۆڤ و ئەندام و بەشەکانی لەشی مرۆڤ**
**چوارەم : ـ مەتەڵی تایبەت بە جلوبەرگ و کەلوپەلی تایبەت بە مرۆڤ**
**پێنجەم : ـ کارکردن و کەرستەی کارکردن و کەلوپەلی دیکە**
**شەشەم: ـ رووەك و بەروبووم و خواردەمەنی رووەکی.**
**حەفتەم : ـ مەتەڵی تایبەت بە زیندەوەر و ئاژەڵ وبەروبوومی ئاژەڵی :**
**هەشتەم :ـ مەتەڵی بیرکاری و ژمارەیی،**
**نۆیەم : ـ مەتەڵی هەمەجۆر.**
**دەیەم : ـ وەڵامی لەخۆی**
**: ـ تەتەڵەی زمان ( تێکەوتن، زمان خلیسکان):**

## ئاين و ئاينداری لە مەتەڵی فۆلکلۆری کوردیدا*:

وەك دەزانین زۆرینەی کورد لە کۆنەوە ئاینی ئیسلامی بە بیروباوڕێکی پتەوەوە وەرگرتووە، ئەمەش لە رەوشت وکردار و بیرکردنەوەی رۆژانەیدا خۆی دەنوێنێت و لە بابەتە فۆلکۆرییە هەمەرەنگەکانی سەردەمە جۆراوجۆرەکانیدا رەنگیداوەتەوە، هەر لەم راونگەیەشەوە زۆرجاران ناحەزە ویژدان رەشەکانی ئەم میللەتە موسڵمانە دڵپاك و بێپشتیوانە لە پەنای ئاین و بەناوی ئیسلامەوە خەنجەری ژەهراوییان لێداوە.

مەتەڵی فۆلکلۆری وەك پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی تواناو زیرەکی و بیرتیژی تاکەکان، لە لایەکی دیکەشەوە بە مەبەستی وانەدادان و پەروەردەکردن بەکارهاتووە، سەرەڕای ئەوەی کەوەك شەوچەرە لە مزگەوت و تەکییە و دیوەخانەکاندا، لە کۆڕی ئاینزانان و خەڵــکی سادە و خوداناساندا کاتی خۆی دراوەتێ، لەم کورتە دەرفەتەدا دەقی هەندێك مەتەڵی فۆلکلۆری ئاین بابەت کە لە دێرزەمانەوە دەربارەی ئاین وبیروباوەڕی خۆیان هەڵیان بەستوون، دەخەینە بەردیدی بەرێزان :

### لەبارەی بیروباوەڕ و فەلسەفەیمردن و ژیانەوە : ـ

1- ((لە هەمو کەسێك بێکەسترە و لە هەمووانیش بە تواناترە)) **(خودا)**

2- ((ئێمە هەمانە و خودا نییەتی)) **(خودا، دایك و باوك، منداڵ)**

3- ((یەکــــە و نابێتە دوو، دووە و نابێتە سێ، سێیە و نابێتە چـوار، چوارە و نابێتە پێنج، پێنجە و نابێتە شــەش، شەشە و نابێتە حەفت، حەفتە و نابێتە هەشت، هەشتە ونابێتە نۆ، نۆیە و نابێتە دە، دەیــە و نابێتە یـازدە، یازدەیە و نابێتە دوازدە، دوازدەیە و نابێتە سێزدە؟))

---

* ئەم بەشەیان ناردرابوو بۆ ئەوەی لە گۆڤاری کاروانی فۆلکلۆر بڵاوبکرێتەوە، ئاگادار نیم بڵاوکرابێتەوە!.

**(یەك خوا هەیە و نابێتە دووان، بەهەشت و دۆزەخ یا شەو و ڕۆژ یا مانگ و خۆر دووانن و نابنە سێ، تەڵاق لە ئیسلامدا سێنە و نابنە چوار، خەلیفەکانی ڕاشیدین (ئەبوبەکر، عـومەر، عوسمان ، عەلی) چوارن و نابنە پیـێنج،مەزهەبی بڕیـــــــاردان (الاحکام) لە سونەدا چوارن(حەنەفی، شافعی، مالیکی، ئەحمەدی)، یان ئاینی ئیسلام ڕێیداوە پیاوێك چوار ژن بهێنێت، یان وەرزی ساڵ چوارن...، ئەرکانی(فەڕزەکانی) ئاینی ئیسلام پێنجن(شەهادە، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج)، نوێژی فەڕز لە ڕۆژێکدا پێنجن و نابنە شەش.**

**بنچینەکانی بـــــــاوەڕی ئیسلام (ارکان الایمان) (بـــاوەڕهێنان بە:خودا، پێغەمبەرەکـــانی، فریشتەکانی، کتێبە پـــیرۆزەکانی، ڕۆژی زیندووبوونەوە، قەزاو قەدەری خێر و شەڕ) شەشن نابنە حەوت. ڕۆژەکانی یەك حەفتــە ، دەرگاکانی دۆزەخ حەوتن ونابنە هەشت. دەرگاکانی بەهەشت ، فریشتەکانی عەرشی خودایان ڕاگرتووە هەشتن و نابنە نۆ. ماوەی ئاوسی ژن (دووگیانی) نۆ مانگە و نابێتە دە، یارانی پێغەمبەر کە مژدەی چوونە بەهەشتیان دراوەتێ دەن و نابنە یازدە، یان ڕۆژی جەژنی حاجیان ڕۆژی دەیەمی مانگەکەیە و ناکەوێتە یازدەمین (...). ژمارەی مانگەکانی ساڵێك، هاوڕێکانی عیسا پێغەمبەر، ژمـــــارەی ئەو بەردانەی موسا پێەمبەر بە داردەستەکەی لێیداون و کانیاویان لێدەرچووە و ژمارەی خێڵەکانی کە لەسەر کانیاوەکان بوون دوازدەنە و نابنە سێزدە...**

4-((هەتا کافر نەبی نابییە موسڵمان؟))

**(لە شادمانی هێناندا لە پێشدا دەڵێن (( اشهد ان لا ا لە))(واتە: شایەدیـد کە هیچ خودایەك نییە) کە ئەگەر تەواو نەکرێت مرۆ کافر دەبێت، بەڵام بە تەواو کردنەکەی (( الا الله واشهد ان محمد رسول الله)) ( واتە :جگە لە یەزدانی مەزن و شایەدیش دەدەم کە محەمەد پەیامنێری خودایە) شەهادەی مرۆی ئیسلام تەواو دەبێت).**

5- ((ڕکت لە هەقێ دەبیتەوە و لەبەر ڕەحمەتی خوداش هەڵدێی؟))

(هەموو کەسێك دەمرێت، کەواتە مردن یەکسانی و هەقی تێدایە، بەڵام مرۆ رکی لە مردنە و نایەوێ بمریت. باران کە رەحمەتی خودایە و خێر و خۆشی و فەڕ و هاتی بە دواوەیە، بەڵام کە باران دەبارێت، خەڵکان بۆ ئەوەی تەڕنەبن و سەرمایان نەبێت لە ترسی باران هەڵدێن)

6- ((چشتێکی عاجباتیم دیت لەم دەشتە، رەوان (رۆح) چوارە، بە لەش پێنجە، بە قاچ هەشتە؟))

(چوار پیاو تەرمی مردووێکیان لەسەر دارەبازە هەڵگرتوە و بەرەو گۆڕستانی دەبەن، چواریان زیندوون و گیانیان هەیە، پێنج لاشەنە، بە هەشت لاق بەرە و گۆڕستان دەڕۆن.)

7- (( بە زیندویی ناڕوا، بە مردوویی دەڕوا ؟))

(دار لە دارستاندا رواوە و ناڕوا، بەڵام کە دەیبڕن و دەیکەنە داری تابووت و دارەبازە و شتی دیکە، ئەوسا دەڕوا)

8- ((بە پێی خۆم دەچمە ماڵی خەڵکی و بە پێی خەڵکی دەچمە ماڵی خۆم؟))

(مرۆڤی زیندوو بە پێی خۆی دەچێتە ماڵی خزم و دۆستانی، بەڵام کە دەمرێت گۆڕەکەی دەبێتە ماڵی یەکجاری ، دەبێت خەڵك بیبەنە ناو گۆڕەکەی.)

9- ((ئەسپی کەس نەبەزاندی (**نەتەراندی**)، لانکی کەس نەهەژاندی، باخی کەس نەچەقاندی چییە؟))

(مردن ئەسپێکی چەتوون و سەر رەق و سەرەڕۆیە، هەرکەسێك بێتە ژیان سواری ئەم ئەسپە دەبێت و هەڵیدەگرێت و دەیبەزێنیت (دەمرێت)، مردووش دەخرێتە نا گۆڕ، گۆڕیش لە شێوەی لانکدایە، بـــەڵام هـــیچ دایکێك ناتوانیت گۆڕی رۆڵەکەی رابژێنێت، لە دوای مردنیش ئەو کەسانەی کار و کردەوەیان باشە دەچنە نێو باخی بەهەشت، داری باخی بەهەشتیش بە دەستی کەس نەچێندراوە.)

10- (( سەیێ نەتاژاندی، بەرخا نەمێژاندی، مێرگا نەچەلاندی.
(شەیتان سەگەکەیە، دایکە حەوا بەرخە بێدایکەکەیە، مێرگی بەهەشتیش کەس نەیچاندووە.)

11- ((کەرێکم هەیە کەس نەیبەزاندووە، گۆمێکم هەیە کەس نەیشڵەقاندووە))
(شەیتان و ئاسمان)

12- ((بیبینی لەبەری ناکەی، لەبەری بکەی نایبینی)) ( خەڵات،کفن، بەرگی مردن)

13- ((ئەوی دروستی بکا بەکاری نایێنێ، ئەوی بەکاری بێنی دروستی ناکا))
(دارە بازە- کفن- گۆڕ)

14- ((دوومبەران دوومبەران، ئاش لەسەر دوو قۆتەران، بەدەوری پیر و پێغەمبەران))
(گۆڕ- کفن)

15- ((سندوق سلیمانە، لە گۆڕەکی پانە، تێیدایە پیرو جوانە)) (گۆڕ)

16- ((باژێڕە دەنگ ژێ ناهێت، سیکە بازاڕێ ژێ ناهێت)) (گۆڕستان)

17- ((دانیشتوانی شارێك هەیە، نەئەمرن، نەباراشیش ئەهاڕن)) (گۆڕستان)

((خەڵکی شارێك نە مردییان لێ دەمرێ و نە ئارد لە ئاش دەکەن، ناوی شارەکەم پێبڵێ؟)) (گۆڕستان، مردوو دووبارە نامرێتەوە و ئاردیش لەئاش ناکرێتەوە)

18- ((گوندی بێ کسۆك)) ( گۆڕستان، ئەم دەقە هی سەردەمێکە کە لە هەموو گوند و هۆبە رەشماڵاندا سەگ بۆ پاسەوانی یا راو راگیراوە، تەنیا گوندێك کە خەڵکی لێ بووبێ و سەگیان نەبووبێ گۆڕستان بووە.)

## چیرۆك و سەرگوزشتەی پێغەمبەران:

19-(( زیندەوەری بێدایك و باوكن، لە بانەوە بانگدەكەن، خەڵكینە خراپەی مەكەن ؟))
**(فریشتەكانی یەزدانی بەخشندە و میهرەبان)**

20- ((ئەلف گوێتییە جیمی قافی ببە لۆ میمی؟))
**(الله) خودا فەرمویەتی: (جوبرائیل)، (قورئان) ببە بۆ،( محمد) پێغەمبەر (د.)**

21- ((میوانێك چووە لای خانەخوێیەك، میوانەكە پێغەمبەری نەبوو، خانەخوێیەكەش خودای نەبوو؟))

**(لە شەوی میعراجدا محمد پێغەمبەر (د.) كە خۆی پێغەمبەرە، چووە لای خودای تاك و تەنیا وبێخودا)**

22- ((هەر لێرە هەتا مازندەران، بپرسن لە ئاقڵ لە سەران، بەرخی مێی و دایكی بەران؟)). ((ئەستێرەی جەدی لە ئاسمانە، كاوڕە مێیە و داكیبەرانە.))
**(چۆن بەران كە نێرەیە بێچوی مێی (بەرخ، كاوڕە مێی)ی دەبێت، بەڵام سەرێك كە ئەقڵ و هۆشی تێدابێت دەزانێت دایكە حەوا ( كاوڕە مێ ) لە پەراسوی باوكە ئادەم (بەران) دروستكراوە.)**

23- ((پیاوێك لە دایك نەبووە و مردووە، یەكێكیش لەدایك بووە و نەمردووە؟)) **(باوكە ئادەم لەدایك نەبووە و مردووە، عیسا پێغەمبەریش لەدایك بووە و نەمردووە) .**
**((ئێمە هەمانە و باوكە ئادەم نەیبووە)) ( ناوك)**
24- ((یەكێك بێ دایك و بێ باوكە ، یەكێك بێ دایكە ، یەكێك بێ باوكە ، یەكێكیش دایك و باوكی هەیە ؟))
**( باوكە ئادەم بێ دایك و باوكە، دایكە حەوا بێ دایكە، عیسا پێغەمبەر بێ باوكە ، خەڵكانی دیكەش دایك و باوكی خۆیان هەیە)**

25-(( زەمین لافاوە, شارێك لەسەر ئاوە، هەموو زیندەوەرێكی لەناوە؟))
**(لافاوەكەی سەردەمی نوح پێغەمبەر و كەشتییەكەی)**

26-((خۆشەویستێکی خودایە، خزمەتکارێکی لەبەردەستدایە، خزمەتکارەکەی لە رۆژی حەشرا عەفوکرایە؟))

**(عوزێر پێغەمبەر و کەرەکەی)**

27- ((ئەشکەوتێکی گۆشتە و تاریکستانە، بەندەی تێدایە، چەند شەو و چەند رۆژ شای نەهەنگان قوتیدایە، دێتە دەرێ نەمردییە و مایە، سوبحانەڵا لەم خودایە؟))

**(ونس پێەمبەر کەوتوتە نێو دەم و سکی نەهەنگ و دوایش خودا دەربازی کردووە.)**

28- (( قەڵای گۆشتینە و رەوانی( رۆحی) پیرۆزی لە بەردایە، بەرگێکی خوری لەبەردایە، لەناو ئەشکەوتێکی گۆشتدایە، ئەشکەوتەکەش لەناو بەحردایە؟)) **(بەرگی یونس پێغەمبەر لە ناو سگی نەهەنگ خوری بووە, نەهەنگیش لەناو ئاوە.)**

29- ((مزگەوتی گۆشتە و میحرابی ئاوە، روو لە هەرکوێ بکا قیبلەی تەواوە (ئەوی بیزانێ ئەقڵی تەواوە؟)))

**(یونس ێغەمبەر لە ناو دەم و زگی نەهەنگ نوێژ بکات، روو لە هەرلایەك بکا قیبلە تەواوە.)**

30- ((تەڵەم ئاوە، زیتەم چیوە، نێچیر رایکرد سەگ بوو پێوە))

**(فیرعەون دەکەوێتە دوای موسا پێغەمبەر (نێچیر) بۆ ئەوەی بیگرێت و وەك نێچیرێك بیکوژێت، (ئاو)ی زێی نیل رادەوەستێت و بواری تێپەڕین و دەربازبوونی موسا(د.) دەدات ،بەڵام کە فیرعەون(سەگ) و دارودەستەکەی دەگەنە قووڵایی زێیەکە، ئاوەکە دەڕوات و فیرعەون و لەشکرەکەی دەکەونە ژێر ئاوەوە و دەخنکێن .هەر وەها دەڵێن ((بە تەڵەی ئاو وەدەبن)).**

31- (( شتێکە بە زیندوویی خواردنی نەخواردووە و بە مردوویی خواردنی خواردووە؟)) **(دارەکەی موسا پێغەمبەر دوای ئەوەی وشك بووە(مردووە) ئینجا سیحری ساحیرەکانی خواردووە)**

32-(( باوکی دارە، دایکی بەردە، منداڵەکەشیان نەبەردە؟))

**(بە دارەکەی موسا پێغەمبەر لە بەرد دراوە و، ئاو دەرچووە)**

33-(( خۆشەویستێکی خودا گوتویەتی:خێزانەکەم (ژنەکەم) خوشکمە، درۆشی نەکردووە؟))

**( ئیبراهیم پێغەمبەر، مەبەستی بوو کە سارا خاتوونی خێزانی لە بیروباوەڕ و ئایندا خوشکیەتی)**

34- ((نە لە ئادەمییە ، نە لە جنیە، قاسیدێ بەیناخەڵکییە))

**(پەپوو سلێمانە پێناوی نێوان سلێمان پێغەمبەر و خاتوو بەڵقیس بووە)**

- ((چەند کەسێك درۆیان کردووە و دەچنە بەهەشتیش))

**( براکانی یەسف پێغەمبەر)**

## دەربارەی نوێژ و رۆژی و زەکات:ـ

35-((چوومە سەر گردەکی هاوارم کردە یەکەکی هەموو هاتن بە جارەکی؟))

**(لە بانگداندا دەچنە سەر شوێنی بەرز و هاواردەکەن و ناوی خودا دێنن، گشت گوندنشینەکان کە دەنگی بانگ دەبیستن، بەتایبەتی لەنوێژی هەینیدا، بۆنوێژکردن بەرەو مزگەوت دەچن.)**

36- ((بڕۆبدە ، دەچم دەشۆم ئەوجا دەکەین؟))

**(بڕۆ بانگ بدە، دەچم دەسنوێژ دەشۆم، ئینجا نوێژدەکەین.)**

37- ((هی دایکت مستێکە و هی باوکت بستێکە؟))

**(لە کاتی نوێژکردندا، ماوەی نێوان دووپێی ئافرەت بە قەدەر کۆڵەمستێکە و هی پیاویش بستێکە یا پێیەکە.)**

38-(( پیاوی نامەحرەم لە سێ شوێنی ئافرەت دەسنوێژی ناشکێت؟))

**(نینۆك، ددان، موو)**

39- ((دارێك هەیە لەناو ئـــاوێ (دارێ گوڵباوێ)، پێنج لکـــان داوێ، سێ لە سێبەرێ و دوو لەبەر تاوێ؟))

**(نوێژکردن دارێکە بە ئاوی دەسنوێژگرتن ئاودەدرێت، لە رۆژێکدا پێنج نوێژ واجبە، سێ نوێژی ( بەیانی و شیوان و نووستنان) لە کاتی سێبەر و**

ڕۆژئاوابووندایە، دوو نوێژی نیوەڕۆ و عەسریش  لە کاتێکدا دەکرێن کە خۆر بە دەرەوەیە).

40- ((پێنجن حەفت و هەشتی پێناوێ، نۆ لە سێبەرێ و هەشت لەبەر تاوێ)).      **بێگومان لە ڕۆژێکدا پێنج نوێژ  فەڕزکراون، نۆ ڕکاتەکانی نوێژی بەیانی و مەغریب و عیشا لەبەر سێبەر دەکرێن، هەشت ڕکاتی دوو نوێژەکەی دیکەش لەبەر خۆرەتاودا دەکرێن.)**

41- ((لە پێنجان دوو بڕوات دەمێنێتەوە پازدە؟))

**(لە پێنج نوێژی ڕۆژێك کە دەکاتە 17 ڕکات، دوو ڕکاتی بەیانی بکرێت هێشتا پازدە ڕکات دەمێنێتەوە.)**

42- ((لە کاتێکدا مەلا نوێژی لەسەر مردوو دەکرد، لە کڕنۆشبردندا دەرزییەك چەقییە نێوچاوانییەوە و مەلا مرد، ئایا خوێنی مەلا دەکەوێتە سەر خاوەن مردووەکە یا خاوەن دەرزییەکە؟))      **(مەلا لە نوێژی سەر مردوو کڕنۆش نابات)**

43- ((تێنانی سونەتە، لە قاندنی واجبە؟))

**(ئەموستیلە لە پـــەنجەکردن، لە زەمـــانی پێغەمبەرەوە (د.) ڕێگەی پێدراوە، بەتایبەتی بۆ ئافرەتان، لە کاتی دەسنوێژگرتندا دەبێت ئەموستیلەکە بلەقێندرێت، بۆ ئەوەی ژێرەکەی تەڕببێت و دەسنوێژگرتنەکە تەواوبێت، زۆر مەتەڵی ئاین بابەت سێکس ئامێزن!)**

44- ((لە قورئانێدانییە و خوێندنیشی لە نوێژێدا واجبە؟)) **(التحيات)**

45- ((تەیرێك هات بە هانەهان، ،دندووك سپی شاقەڵ کەوان، گەورەی گرتن، گچکەی بەردان؟)) ،((تەیرەك هات بو سیسی، عیسا لە موسا دەپرسی، ئەو مەلە بۆچ ڕۆیی بە برسی ( بە سیسی) ؟))

46- ((مەلێك هات بە هانە هان، شاپەڕ سپی تیر و کەوان، عیسا لە موسای پرسی، ئەو مەلە بۆ ڕۆیی بەبرسی؟))

**(مانگی رەمـــەزان وەك باڵندەیەكی ماندوو لە دوورەوە دێت، نیشانەی هاتنیشی بریتییە لە دەركەوتنی مـــانگی سپی و یەكشەوی كـــەوانەیی، گەورەكان رۆژوویان لەسەرە و دەبێ بیگرن، منداڵە بچووكەكانیش رۆژوویـــان لەسەر نییە، مـــرۆڤ كە بەرۆژوودەبێت لە برسانا سیس دەبێت.**

47 – ((سندوقی زەردی یەمەنی، تەقڵە مەكە ئەیشكێنی، تەقڵە مەكە كلیلدارە، لە هەموو شارێك خەبەردارە؟))

**(گەر رۆژووەوان بەرۆژی روونـــاك و زەرد، خـــواردن و خـــواردنەوە بخوات ئەوا رۆژووەكەی دەشكێت، رەمەزان دەمی رۆژووەوان كلیلدەدات و ناهێڵێت خـــــواردن و خـــواردنەوە بخوات، كە مـــانگی رەمەزان دێت، مـــوسڵمانانی هـــەموو شـــارەكان ئاگاداردەبن و خودای دەسەڵاتداریش دەزانێ كێ رۆژوودەگرێت و كێش بە رۆژوو نابێت.**

48– ((دوازدە كوزە گندۆرەی ساڵ، یەك حەرامە و یازدە حەڵاڵ؟))

**(ساڵ دوازدە مانگە و تەنها مانگێكیان رەمەزانە و بە رۆژ خواردنی تێدا حەرامە.)**

49–((سی سوار هاتنە **شارەكی هەر سی چوونە هەموو مارەكی (ماڵەكی)؟))**

**(سی شەوی مانگی رەمەزان لە هەموو شارێكدا دەبنە میوانی هەموو ماڵێكی موسڵمان.)**

50–((دارێك شەست سێوی پێوەیە، سی سێویان سپینە و ناخورێن، سیشیان رەشن و دەخورێن؟))

**(سی رۆژی رەمەزان خواردنی تێدا ناخورێت وسی شەوەكەش (سێوە رەشەكان) خواردنی تێدا دەخورێت.)**

51– ((**تەنافێكم هەیە ئەگەر بیگرم كزدەبم، گەر بەری‌دەم گوناهباردەبم**)) (رەمەزان)

52–(( هی‌خۆتە و هی‌خۆت نییە؟))، (( ئێستا هەمووی هی‌خۆتە و پاش ساڵێكی دیكە هەندەكی دەبێتە هی‌خەڵكی.))

**(دراو و سەرمایە و ماڵی زیندە و... هی خـــــاوەن ماڵەکەیە، بـــەڵام زەکاتی لێدەکەوێت، بەشە زەکاتەکەیش دەبێتە مـــاڵی هـــەژار و خەڵکیتر، هەروەها ساڵانە زەکات لە سەرمایەدا نوێدەبێتەوە.)**

## لەبارەی دابونەریتی نانخواردنی موسڵمانان :ـ

53- ((ئەوەچییە :. سەری نانی بنی نانی؟))

**(لە سەرەتای نانخواردن دەڵێین :. بەناوی خودا ((بسم الله)) و لە کۆتایی نانخواردنەکەش دەڵێین سوپاس بۆ یەزدان (الحمد لله)...)**

## لەبارەی خزمایەتی و شەریعەتەوە:

54-((لە باوکتە و لە دایکتە، نە براتە و نە خوشکتە)) **(خۆتی)**

55-((یەکێك ترومبێلێکی دەهاژوا و منداڵێکی لەگەڵدابوو، لێیان پرسی:.
ئەو منداڵە چی تۆیە؟ ئەویش گوتی:. کوڕی منە و منیش باوکی نیم؟))

**(لێخوڕی ترومبێلەکە دایکی منداڵەکەبوو)**

56- ((ژنێك و پیاوێك بە ڕێگەدا دەڕۆیشتن، لەژنەکەیان پرسی :.
ئەو پیاوە چیتۆیە وا لەگەڵی دەڕۆیت،؟ ئەویش گوتی:. کوڕی کوڕمە و برای مێردمە، ئەم خزمایەتییە چۆن دەشێت؟))

**(دوو پیاو ژن بە ژنی بە دایکیان دەکەن و یەك و کوڕیان دەبێت و ئەم خزمایەتییە دێتە ئاراوە.)**

57- ((دوو پیاو ژن بە ژنی بە دایکیان دەکەن، یەکێکیان کوڕێکی بوو و ئەوی دیکەش کچێك. ئایا ئەم دوومنداڵە دەبنە چی یەکتری))

58- ((دوو ژن دەیانگۆتە دوو پیاوان:. هەڕنەوە کوڕێت مـــە، وەرنەوە مێرێت مە، بابێت هەنگۆنە خەزیرێت مە؟)) **(دووپیاو ژن بە ژنیان بە دایکیان کردبوو)**

59- ((دوو ژن ماندوونەبوون لە دوو پیـــاوان دەکەن و دەڵێن: مـــاندوونەبن باوکەکانمان ومێردەکانمان . ئەم خزمایەتییەیان چۆن بووە؟))

(دوو پیاوەکە ژن بە ژنیان بە کچەکانیان کردووە)

60- ((ئافرەتێك و دە پیاو لە ژێر دەوارێك دانیشتبوون، میوانێکیان هات و لە ژنەکەی پرسی:- ئەو پیـــاوانە چی تۆن؟ ژنەش گوتی:- یەکیان مێردمە و چـــواریان شوبرامن، پێنجیشیان برامن! هـــەمووشیان لە یەك دایکـــن! ئەم خزمایەتییە چۆن دەشێ؟))

(بێوەژنێك پێنج کوڕی دەبێ و مێرد بە باوکی کچەکە(ژنەکە) دەکاتەوە، کوڕێکی بێوەژنەکەش کچەکە مارە دەکات، بێوەژنەکە لە باوکی کچەکە پێنج کوڕی دەبێ)

61- ((شوانێك لەگەڵ دە ژنان بێری مەڕی دەکرد، یەکی لایدە هات وپرسی :- مام شوان! بۆ ئەو ژنانە بێکەسن؟ شوانەش گوتی:- بێکەس نین، سێیان خـــوشکمن، سێ دایکمن، ســـێ کچمن، یەکیشیان ژنمە و دایــکی هەمووانە!؟ لایدەکەش داما، دواتر خزمایەتییەکەی بۆ لێکدانەوە))

(بێوەژنێك سێ کچی دەبێ، هەرجارەی کچێکیان شوو بە باوکی شوانە دەکات و ئەویش تەڵاقیان دەدا، سێیەم کچ لە باوکەکە سێ کیژی دەبێ، شوانەش بێوەژنەکەی دایکیان مارەدەکاتەوە و سێ کچیان دەبێ.)

62- ((پیاوێك بانگی پیاوێکی دیکەی دەکرد ودەیگوت: . هۆ! هۆ! خاڵە! ئەتۆ خاڵی منی وئەمن مامی تۆمە، باوکی من باپیری تۆیە! ئەم خزمایەتیە چۆن دەشێت؟))

(کچ و دایکێك مێرد بە باوك و کوڕێك دەکەن، باوکەکە کچەکە مارەدەکات، دایکەکەش شوو بە کوڕی پیاوەکە دەکات، یەك و کوڕیان دەبێت و ئەم خزمایەتییە پەیدا دەبێت.

63- ((کچێك بـانگی کوڕێکی دەکرد و دەیگوت : هۆ خاڵە ! ئەتۆ خاڵی منی و ئەتۆ مامی منی ! ئەم خزمایەتییە چۆن دەشێت؟))

64- ((ژنێك بە دیار تەرمی مردووێك دەگریا و دەیلاواندەوە و دەیگوت:. هەی مێردە رۆ! هـــەی برا رۆ! هەی کوڕە رۆ!. راستیشی دەکرد. ئەم خزمایەتییەیان چۆن بووە؟))

65-((رۆژێك چوومە ســـەر گۆڕســـتان، دیـــم ژنێك دەگریێ و لەخـــۆئەدا بە کوڵەمستان. گوتم بـــۆ دەگری و وا کردووتە قووڕپێوان، گـــوتی برای ژنی ئەم مردووە خاڵمە ماڵوێران؟))

(ژنەکە بۆ باوکی گریاوە)

66-((پیاوێك نوێژی دەکرد، کە سەلامی لای راستی داوە سی رۆژی رەمەزانی لەسەر واجب بـــوو! کە سەلامی لای چەپی داوە تـــەڵاقی کەوت! کە هەستاوە سەرپێیان نوێژەکەی بەتاڵبوو !؟))

**(کە سەلامی لای راستی داوە مانگی یەك شەوەی رەمەزانی لە ئاسمان بینی. لە لای چەپدا کۆنە مێردی ژنەکەی خۆی بینی کە دەساڵبوو بیٚ سەروشوێن بوو ئەویش ژنەکەی مارەکردبۆوە،بەڵام کە مێردی یەکەمی هاتەوە تەڵاقی دووەمیان بەتاڵ دەبیٚ. کە هەستاوە ئاوی بینی، ئەویش بە تەیەموم دەسنوێژی گرتبوو، کە ئاو پەیدابو تەیەموم بەتاڵە)**

67-((سیٚ کاروانچی بە رێگەدا دەڕۆیشتن، خـــەریکبوو لە برســانا بمرن، گەیشتنە کەلاکی کەرێکی تۆپیو، یەکێکیان تێر گۆشتی کەری تۆپیوی خوارد، دووەمیان تانیوە تێربوو خواردی بۆیان حەڵاڵبوو، بەڵام سێیەمییان هیچی نەخوارد چونکە بۆی حەرامبوو!؟))

**(کە زۆریان برسیبوو و خەریك بوو لە برسانا بمرن لە ناچارییدا کەلاکی کەری تۆپیو حەڵاڵبوو، یـەکەم تێری خــوارد و دووەم نــیوە تێر و سێیەمیش هێشتا هــیچی نەخواردبوو کە کاروانێکی دیکە هات و خواردنی زۆریی هەبوو، بۆیە دواتر خواردنی کەرە تۆپیوەکە حەرام دەبێتەوە.)**

68- ((ژن و مێردێك لەسەر رۆخــی رووبارێك دەپەڕینەوە،پیاوەکە تەڵاقی لە ژنەکەی خوارد کە نابیٚ لەم ئاوە بپەڕێتەوە ،پیاوەکە پەڕییەوە، دواتر ژنەکەش پەڕییەوە و تەڵاقی مێردەکەشی نەکەوت؟)).

**(ئەو ئاوەی کە پیاوەکە سوێندی پیٚخواردبوو تێپەڕیبوو)**

69- ((پیاوێك بەرامبەر دوو ژنی رووت دانیشتبوو.نەزەری ژنەکانی بۆ حەرام نەبوو، بەڵام کە ژنەکان سەیری پیاوەکەیان دەکرد, نەزەرەکەیان حەرام بوو؟))

**(پیاوەکە کوێر و نابینابوو)**

70- ((کەڵەبــابیماڵیٚ حەسەنی، لە ماڵیٚ حوسێنی دانی دەخــوا و لە مــاڵیٚ حەسەنی هێلکەی دەکــا، ئــایــا هێلکەکە دەبێتە هی مـــاڵیٚ حــەسەنی یــان حوسێنی؟))

**(کەڵەباب هێلکە ناکات)**

**لە بارەی خەون و خۆشۆرینەوە : ـ**

71- ((درۆیە، راستە، واجبە؟ ))

((وانییە و وایە، راستە و درۆیە، فەرزە و واجبیشە))

**ئیحتیلامبوون ( شەیتانیبوون) لە خەودا روداوێکی راستەقینە نییە، بەڵام بە راستی لەش پیس دەبێت و خۆشووشتنیش واجب دەبێت.**

72- ((ئەوە چییە ئینسان دەیبینێ ، خودا نایبینی ؟)) **(خەون، مردن)**

**دەربارەی قورئان و سوێند بەدرۆ خواردن: -**

73- ((دەستووری ژیانە، دادوەری یەکسانە، ستایش و فەرمانە، خاوەنەکەی یەزدانە؟))

**(قورئان)**

74-(( سی تاق، سی بەرتاق، سی دەرگەیە و سی حوجرەیە؟))

**(سی جزمی قورئان)**

75- **((چەنی چەنی ، پێ بەرداشە، لە سەر بەنێ تەیر و تاشە، رێنابەنی)) (قورئان)**

76-((دارێکم هەیە وشیە ترێی دەگری، ئەوی بە ناهەق بیخوا پێی دەمری.؟)) **( قورئان دارێکی پیرۆزە وبەری شیرین و سوودبەخشی هەیە ، ئەوی بە درۆ و بە ناهەق سوێند بە قورئان بخوات، ئەوا تاوانێکی گەورە دەکات ، قورئان دەیگرێت و لەبەرچاوی خەڵك دەمرێت.**

77- ((ماڵی بێ دەرگا، مزگەوتی بێ میحراب)) **(ماڵی خودا، کەعبە)**

## چەند تێبینییەك :-

1- لێرە بەدواوە پتر وەڵامی مەتەڵەکان، بەبێ ڕاڤەکردن و لێکدانەوەیەکی درێژ دەنووسین، مەگەر زۆر پێویست بێ، چونکە ئەوەی بەشەکانی پێشتر بخوێنێتەوە، ئەوا شارەزاییەکی باش لە شیکردنەوەیان پەیدا دەکات، زۆر خوینەری بەڕێزیش بە بیستنی پێشتری یا بە سەلیقە دەیانزانیت.

2- لە دەقی زۆر مەتەدەڵاندا دەقی هاوشێوە هەن زۆر لە یەکتر نزیکن بە جۆرێك کە تەنها وشەیەکیان یا دەستەواژەیەك یا ڕستەیەکیان دەگۆڕێت، بۆ ئەوەی دووجار ئەم جۆرە دەقانە نەنووسینەوە و خوێنەریش بێزارنەکەین، وشە یا ڕستە جیاوازەکەمان لە نێو(...) داناوە و خستوومانەتە نێو دەقی مەتەڵەکەوە، وەك لە بری ئەم دوو دەقەی خوارەوە:.

أ- ((وی لای پەرژان، وی لای پەرژان، لنیڤەکێ مۆرو مەرجان)) (چاو)

ب- ((وی لای پەرژان، وی لای پەرژان، دناڤ دا مۆرو مەرجان)) (چاو)

بەم شێوەیە نووسیومانە:.

((وی لای پەرژان، وی لای پەرژان، دناڤ دا (لنیڤەکێ) مۆرو مەرجان)) (چاو)

هەروەها لە جیاتی :

ا-((مەیلەکم هەیە مەیلانی، لەناو بوخچەی سوبحانی،خودا نەبی کەس نایزانی))

ب-((مەیلەکم هەیە مەیلانی، لەناو بوخچەی سوڵتانی، خودا نەبی کەس نایزانی))

نووسیومانە:.

((مەیلەکم هەیە مەیلانی، لەناو بوخچەی سوبحانی (سوڵتانی)، خودا نەبی کەس نایزانی)) وەڵام (منداڵ لەزگی دایکی)

3–دەقی مەتەڵەکانمان لەنیوّ جوت کەوانە ((..)) نووسیون و وەڵامەکانیشمان لە نێوان (..) نووسیون، وەك: ((چەندی بیدەیێ تێرنابی)) وەڵام (مقەس)

4–هەندێك مەتەڵ چەند وەڵامێك دەگرنە خۆ، بۆ دووبارە نەکردنەوەی دەقەکان لە وەڵامدانەوەدا داشمان (–) خستۆتە نێوان وەڵامەکان وەك:.

((چەندی بیدەیێ تێرنابی)) وەڵام ( چاو– نەفس– مقەس)

5– بۆ وشەکانی هـــاو واتا و هەمان مەبەست و هەمان وەڵام فاریزەمان(،) لە نێوان داناون، وەك:

((دارەبەنێ لە قەد کەنێ، شێخ و مەلا دەست ئەدەنێ)) (کەپوو، لووت، دم، دفن)

هەروەها بۆ ئەو مەتەڵانەی کە چەند بابەتێکیان تێدایە، هەر وەك بۆ دەقەکە فاریزە هەیە، هەر ئەوهاش بەرامبەر وەڵامەکانییان فاریزەمان داناوە وەك:–

((دینم لە نەڕوای، باردەکەم لە نەزای، دەڕۆم لە نەبڕای؟))

(خوێ، هێستر، ڕێگە و ئاوی رووبار)

واتە:– نەڕوای = خوێ، نەزای = هێستر، نەبڕای = ڕێگە و ئاوی روبار

((دایکی قەڵەوە، باوکی درێژە، کچی جوانە، کوڕی بڕێژە؟))

(زۆپا، لوولە، ئاگر، خۆڵەمێش)

6– لە گوتنی زۆربەی دەقی مەتەڵەکاندا،چەند وشەیەك وەك ئامرازی پرسیار بەکاردێن وەك :– ئەوە چییە ؟ ئەوشتە چییە؟ شتێك هەیە؟ ...، بۆ ئەوەی دەقەکە ببێتە پرسیار، بەڵام ئێمە بۆ کورتبڕی لە هەموو دەقەکاندا وشە و ئامرازە پرسیارەکانمان دووبارە نەکردۆتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە خوێنەر و بیستەر لەگەڵ دەقەکان راهاتوون کە بەبێ گوتنی ئامرازی پرسیارەکان خۆیان دەزانن دەقەکان پرسیارن، ئێمەش بۆ پتر ئاشکرا کردنی ئامرازی پرسیارە لادراوەکە نیشانەی پرسیارمان (؟) بۆ داناون ،وەك:

((دیوێکی هەسانە، دیوێکی قورئانە؟)) (کوارگ،کارگ، قارچك)

کە لە راستیدا دەبێ بگوترێ : ((ئەوە چییە دیوێکی هەسانە و دیوێکی قورئانە؟))

((سەری مارە، پشتی کارە، زگی بەرخە، دوو کەلەخە؟)) (پەڕەسێلکە)

((دندووکی قەڵەم، سەرکی مارە، ژێر سکی بەرخە، پشتی کارە؟)) (پەڕەسێلکە)

((کلك مەقەس، ڕوو هەترەس؟)) (پەڕەسێلکە)

((ڕەشە وەکی قەترانی، سپییە وەکی کەتانی، سۆرە وەکی مەرجانی، دەفڕێ دەچتە ئاسمانی؟))
(پەڕەسێلکە – لەگ لەگ)

((لە ڕویناسی* سۆرترە، لەبەفری سپی ترە، لە فیلی ڕەشترە؟))
(پەڕەسێلکە– لەگ لەگ)

((ژ بەفرێ سپی ترە، ژخوینێ سۆرترە، ژقیری ڕەشترە، ژچیای بلندترە، ژ بەری نزمترە؟)) (پەڕەسێلکە – لەگ لەگ، حاجی لەق لەق)

((لە ئاسمانان تەبەق تەبەق، لەسەر میلی کورت و کەڵەك، ماندوو نەبی عەبابەڵەك؟))
(لەق لەق)

((سەت سوار هاتن لە کویتەڵێ، یەك لە یەکی خۆشتر دەڵێ؟))(ڕەوی قاز و قوڵنگان)

(( لە حەوایە وەکو نیسکە، لە ئاوێیە وەکو گیسکە؟))
(قاز و قوڵنگ لە دوورەوە لە ئاسمان بچووك دیارن و لە ناو ئاودا گەورە دیارن)

((مل نەخشینە و لە چیای زۆرە، ڕەنگی بۆرە و قاچی سۆرە، دوژمنی خۆیتی و خۆخۆرە؟))
(کەو)

((پوورەکم هەیە لە کێوی، بە ربان[1] هێلکەی ئەپێوی؟)) (کەو)

---

*ڕووناس گیایەکی سرووشتییە ، ڕەنگی ریس و خوری پێ سوور دەکەن
1-ربة =دەفرێکە نزیکەی 8 کیلۆ طەنم دەطریَت، درکەیە بۆ ئەوەی کە ماکەو هیَلکەی زۆر دەکات.

((هەژ زاخۆ هەتا سولەیمانییێ، هەمی کچێت چاڤ کلووکن؟)) **(کەو)**

((ژ ڤێرێ هەتا بلبل، هەمی لاوێت چاڤ ب کل؟))؟؟ **(کەو)**

((دەچمە ناو حەسارەکی، بانگ دەکەمە یارەکی، سەتم لۆ دێن بە جارەکی؟))
**(مریشك داندان)**

((مەلای بەیانیان بانگ دەدا، ئاوی دەخواتەوە و نوێژێش ناکا؟)) **(کەڵەشێر)**

((مەلای نا مەلا، ڕدێن دوو لیسکە، ئەولادی قوونێ چاوناسی شەوێ)) **(کەڵەشێر**

((مەلای (سۆفی) بەڕدێن، ڕدێنی بەموو، چەرمە چەکاڵتە، هەیهو هەیهو؟))
**(کەڵەشێر، کەڵەباب، دیکل)**

**((مام هورمزە، ردێنی قورمزە، سۆفی سەحەرە، خواردنی پاشەرۆکە؟)) (کەلەشێر)**

((سۆفی سەحەری، مامی دوو ڕدێن، ئەولادی قوونێ ؟)) **(کەڵەباب)**

((سەری بە ردێن، ردێنی بێ موو،چەرمە چەکاڵتە، هەیهوو هەیهوو؟)) **(کەڵەباب)**

((مەلای نامەلا، فەقێی نافەقێ، سۆری دوو فلیقان، ئەولادی قوونێ ؟))**(کەڵەباب)**

((پیرە مامێ لە خەرێ، بەڕدێنی ئەرێ بەرێ ؟)) **(کەڵەباب)**

((سەر مشارۆ، پێ خەپارۆ؟)) **(کەڵەشێر، کەڵەباب، دیکل)**

**((سەری شاخە، کلکی کێلە، قنگی کێرە، دەنگی دلێرە، ناوی شێرە؟)) (کەڵەشێر)**

((سینگ لەسەر پشتێ، بە قوونی هەنگشتی))**(کەڵەشێر لەسەر پشتی مریشك بێ)**

**((دەم لەسەر سەری، پێ لەسەر پشتی، ئەولادی گشتی؟)) (کەڵەشێر لەسەر مریشك)**

**((دوو پێی لە عەردی، دوو لەسەر پشتی، دەم لەسەر سەری، باڵ لە تەنیشتی؟))**
**(کەڵەشێر لە سەر پشتی مریشك بێ)**

**((ئاقڵدارەکەی ئاقلێ بەگیرە، لە نێو مەلاندا کامیان بەشیرە؟)) (شەمشەمەکوێرە)**

**((ئەگەر ئاقڵ داری و ئەقڵت لە بیرە، لە تەیرەکانا کامیان بەشیرە؟)) (شەمشەمەکوێڕە)**

**((بە ڕۆژ دەنوێ ،بە شەو کاسبی دەکا؟)) (شەمشەمەکوێرە– سیخوڕ)**

**((تەیری بێ پەڕ ؟)) (شەمشەمەکوێرە)**

**((سێ پا دەر زەمین، چوار پا دەر باڵە بزن، بزەنی باری تەعالا، جرتی بەفرتی، تەماشای بکە، فرتی بە جرتی؟))؟؟ (مشك)**

**((چاو ڕەش و گوێ مووچ لمووز بەرازانی، مێملی هەمبانە وداندۆك ونانی، دەر و ژوور دەکا زۆر بە پەنهانی؟))**
**(مشك)**

**((سوورەباوێ ، چووە راوێ، کەوتە داوێ ؟)) (مشك و تەڵە مشك)**

**((چوار سەنگەر و نانێکی ئیعدامێ؟)) (تەڵە مشك)**

**((سێ ژووری ئیعدامە، ئەو نانەی دەیخوا حەرامە؟)) (تەڵەی مشك)**

**((قاسمی دیوار سمی؟)) (مشك – مێرووله)**

**((لوولەی گۆشتین، دیوار ئەبڕی؟)) (مشك– جورج)**
**((مامێکم هەیە لەبن گڵی،بە سمێڵی خۆی (بەگونان) دەڵێ وڵی وڵی؟)) (جورج)**

**((مەیلەکم هەیە لە دەشتێ، حەفسەد کونی لە پشتێ ؟)) (ژووژك– ڕەشکەی کا)**
**((مامەکم هەیە لە دەشتێ، بارەك نەشتەری لە پشتێ ؟))** (ژیژی، **ژووژك)**

**((ئێك دهات ژدەشتێ، ملەکێ ستریا ل پشتێ، من گۆتی مام دێ چکەی، گوت دێ چمە بەهەشتێ، من گۆت بۆچی؟ گۆت خۆشترە ژدەشتێ ؟)) (ژووژك، ژیژی)**

((مامەکی من ل دەشتێ، بارەکێ ستریا ل پشتی، دکت ناکت ناگەهتە پشتێ ؟)) (ژیژی)

((مامەکم هەیە لە دەشتێ، سێ سەد تیری لە پشتێ؟)) (ژیژی،ژوژك–سیخوڕ)

((چار پەل دەڕوا لە ڕێیە، قالبی دڕك و زرێیە، چاوی دەرێی ترێیە؟)) (ژوژك)

((مەتەڵ مەتەڵ بەتیزە، باری کەرەکەم نەقیزە؟)) (ژیژی، ژوژك– سیخوڕ)

((لەبن خوری، لەسەری دڕی، هەتا دەزانی پێوە دەتڕی؟)) (ژوژك– سیخوڕ)

((خاڵۆیەکم هەیە، هوونی هوونی،دەست لە باخەڵ، سەر لە قوونی؟)) (ژوژك)

((هۆلك مۆلك، مامێ تەیێ دفن گۆلك؟)) (ژیژی، ژوژك)

((پیرە مامێ لە تەلانی، تیران داوێ بێی کەوانی؟)) (سیخوڕ)

((بەسەر پیرەژن، بەچەنگ مناڵە، بەپشتی ڕۆستەم نەتەوەی زاڵە؟)) (سیخوڕ)

((بەسەر کافرە، بەپێ منداڵە، بەتیر وکەوان ڕۆستەمی زاڵە؟)) (سیخوڕ)

((کەللە خڕ، سمێل بابڕ، پەرچەم مەریوانی، راوچی ماڵێیە و کەس بە هەستی نازانی؟)) (پشیلە، کتك، فۆلکلۆر نییە ؟)

((هەل هەلە، سمێل بەلە، وێ دگەڕێت، لسەر تاڤێت کودەلا؟)) ؟؟ (پشیلە، کتك)

((سەر گل گلە، بن گل گلە، چاڤ زیق و سمێل بەلە؟)) (کەروێشك، کیفریشك)

((هەر ل ڤان دەرا، هەر ل وان دەرا، تشتەك دەرکەت ل ناڤ بەرا، پێت گورگا، گوهێت کەرا؟)) (کەروێشك، کێڤریشك)

((هەلو دەرا، هەلو دەرا، شین پێت سەگا، گوهێت کەرا؟)) (کەروێشك)

((چ ل دەشتیٚ بیت، چ ل ناڤ بەرا، چ لەبەر قورمێن داروبارا، پێن گورگانە، گوهێن کەرا ؟))

**(کەروێشك،کێڤریشك)**

**((پاسەوانی بەکارە، لە پشت دەرگاو دیوارە، بە سەرمایێ زۆر هارە؟)) (سەگ)**

**((چاومۆنی کلك بۆرە، فێڵبازی مامر خۆرە، نرخی پێستەکەی زۆرە؟)) (رێوی)**

**((بۆرەی چاو زەرد بەهێزە، راوچییەکی بە پارێزە، شەوبینە و رەنگی دێزە، مگێزی لە هەوێزە؟)) (گورگ)**

((هەڤرستە، تاتە ڕستە، خۆش فێهرستە؟)) **(هرچ، ورچ)**

((چوار چەلێ، گوە بەلێ، دوازدە گولێ، پیرێ خەرتەلێ؟))

**(چوار پەل و گوێی بەل و دوازدە گوانی مالۆسێك)**

((چار دەچەقن، سێ دەلەقن، دوو دەزەقن، دوو دەڕەقن؟))

**(چوار پەل و، گوێ و کلك و، دوو چاو و، دوو شاخی بزن؟)**

((چواری چەقە، دووی زەقە، دووی ڕەقە، دووی لەقە؟))

**(پەل و چاو و شاخ و گوێی بزن)**

**((چوومە دۆلەکا ب خڕەبەر، من داپیرا تە گرت، باپیرێ من خۆ هاڤێتە سەر؟))**

**(تەگە دەپەڕیتە بزن)**

((چوومە لێرەکی پەدار پەدار، قەت دارەکی وەنەبوو بکەمە دەستەدار؟))

**(شاخ،قۆچی بزن)** **((چوومە شکەفتەکێ تژی گۆپالێ، ئێکی وە نەبوو دەستێ خۆ بگرم بەمە مالێ ؟))**

**(قۆچ، شاخی بزن)**

((ئەڕوا بۆ دەشت رووی لە مالە، ئەڕوا بۆ مالێ ڕووی لە دەشتە؟)) **(شاخی بزن)**

((هەموو نوستن، گزگل بەپێوە؟)) **(شاخی بزن)**

((کلك ڕەپ بوو، قوولە ڕەش دەربوو؟)) **(بزن کلکی قیتدەکاتەوە و پشقل دەکا)**

((قیتمانه، قیت دەبتەوە، غیلمانه، غل دەبتەوە؟)) **(بزن پشقل(کشپل،قشپل) دەکا)**

**((سەر باڵ باز و بن باڵ سوێسکە، ئەڕنەمووك ئەو.......؟))؟؟؟**

((لنگه دەستاڕێ له لێژی؟)) **(دوونگ)**

((یەکه و پێی دەڵێن دوو؟)) **(دوونگ)**

((مەڕەمای قوونێ دەخۆی یان دەرخۆنەی قوزی؟)) **(دوونگ)**

((دەرخۆنه لەسەر قوونه، چەند خۆشه و چەند بەڕوونه؟)) **(دوونگه مەڕ)**

**((دیزەی روونه، دەرخۆنەی قوونه، ئەگەر نایخۆی بۆ منی بێنه؟)) (دوونگ)**

**((دەرخوینکێ قوینێ، دەرمانێ گرارێ ؟)) (دوونگی بەرانی)**

**((سەرپۆشی قوزی، دەرخۆنەی قوونی، نێری دیاره بەکیر و گونی؟))**

**(دوونگی مەڕ و بەران)**

**((ڕەقۆزەی قوزی، تامی چێشتی؟)) (دوونگی مەڕ)**

**((سەرقاپی قوونێ، تامی برویێشێ، هەرکەس نەیزانێ چاوانی بێشێ؟)) (دوونگ)**

((دەستاڕۆکێ بەکەڤری ڤە؟)) **(دوونگ)**

((شتێك هەیه له چیایه، سپیاتی سپیانی تێدایه، ناوی گێزەر گیایه، جەرگم بووه کون به کون، کوندەلأنم بیننه کن؟)) **(ژاژی پەنیری رەوندی کوێستانان)**

((چەرمه و گەرمه و نەرمه، دۆخینی( بەنەخوێنی) بکەوه ، بینه بەرمه، ئەگەر نەم خوارد، بده له سەرمه؟))

**(گیپه)**

**((گەرمیشه و نەرمیشه، بەنەخوێنەکه بکەوه و تێینیشه؟)) (گیپه)**

((فڕنی فرنی فرناوێ، گێزبەلەی بەر هەتاوی، سووژنی له قوونێ باوێ (درێشەی له کوونێ هەردەی)، هەوەست دەچته ماستاوێ ؟)) **(کەباب)**

((ناوی ئاسن دەری گۆشتە)) **(کەباب)**

((هەشتیان هەترە مەتیتە، چواریان مەچیتە چیتە، یەکیان بانە پلیتە، دوویان پانە پلیتە(مێرەمە قیتە)؟))

**(گوان و چوارپەل کلك و گوێی سەگ)**

((هەشتی هەر تەڕە مەتینە، دووی لە دۆڵەمەقینە، چواری مەچیتە چینە؟))

**(گوانی سەگ و مەڕ و مانگا)**

((چواری چێلی، هەشتی دێلی، دوازدەی ڕەمە چێڵی؟))

**(گوانی مانگا و دێڵە سەگ و مالۆسی بەران)**

((شتێك هەیە شتانە، نام لە بوخچەی سوڵتانە، تا ساڵێکی دی ئەو دەمانە؟))

**(ماوەی ئاوسی ماین و ماکەر)**

((کۆنە ناڵێك، نامە چاڵێك، هەتا ساڵێك؟)) **(ئاوسی ماین)**

((لەتە ناڵێ خستمە پاڵێ، هەتا ساڵێ ؟)) **(پەڕینی ئەسپ وماوەی ئاوسی ماین)**

(( ئەوڕۆ چوومە دەشتێ، دەعبایەکم گەیشتێ، شەش پێ لە عەردی، دوو لە تنیشتێ، یەك لە قەڵیشتێ ؟))

**(ئەسپ سواری ماین بووە)**

((زگی خەزنەیە، پشتی مرادە، قوونی گووفەکە؟))

**(سگی ماین جێگەی زاوزێکردنە و جوانە ماین زۆر بە نرخە، پشتی خۆشە بۆ سواربوون وگەڕان، لە قنگییەوە تەرس دەردەدا)**

((لە زەمانی پیر و چاکان، کوڕ گەورەترە لە بابان؟)) **(هێستر لە (کەر) گەورەترە)**

**((هەر لە زەمانی پیر و ئەسحابی، کوڕ گەورەتر بووە لەبابی؟)) (هێستر)**

**((هەلەران و مەلەران، لە دەوری باب و باپیران، کوڕ چاترن لەبابان؟))**

**(هێستر کوڕی کەرە و لەباوکی باشترە)**

**((مامکێ منۆ... کوڕ ژبابێ مەسترە؟)) ((کوڕ ژ بابی مەزنترە؟)) (هێستر)**

((هەموو توخمەکەی ببڕێتەوە، ساڵێ تر سەوز ئەبێتەوە؟)) **(هێستر)**

((دەڕوا لە ڕێ ڕێ، نەدەچێندرێ، نەدەڕوێ ؟)) **(هێستر)**

((گوێ درێژی ئاقڵ هیچ، دەنگ ناخۆشی یاپراخ پێچ، هەوراز بڕی بە پێچ چێچ))
(کەر، گوێدرێژ)

((حەیوانە و گەلەک ژیرە، ژیر بی، ژیرت وەبیرە؟)) **(مرۆڤ–مەیموون–ماین)**

**ئەم مەتەڵە وەڵام بدەوە:**

**((زیندانێك دوو دەرگای هەیە، دەرگایەکیان بەرەو ئازادبوونە، دەرگاکەی دیکەیان مەرگە، لە هەر دەرگەیەکدا پاسەوانێك هەیە، دەرگاوانێکیان هەرگیز درۆ ناکات و ئەوەی دیکەشیان هەرگیز راست ناڵێت، ئەگەر یەکێك لە ناو زیندانەکەدا بەندکرابێت و نەزانێت کام دەرگا بەرەو مردنی دەبات و کامە دەربازی دەکات، نەشزانێت کامە پاسەوان راستگۆیە و کامەشیان دروزنە، بەڵام بۆی هەبێت تەنها پرسیارێك لە پاسەوانێکیان بکات، چ پرسیارێك دەکات بۆ ئەوەی دەرگای دەرباز بوون بدۆزێتەوە دەرباز ببێت؟**

## هەشتەم :مەتەڵی تایبەت بە بیرکاری.

| | | | |
|---|---|---|---|
| 15 = | 4 | 9 | 2 |
| 15 = | 3 | 5 | 7 |
| 15 = | 8 | 1 | 6 |
| 15= | 15 = | 15 = | 15 = |

**دەقی زۆر مـــەتەڵان تایبەتن بە بیرکـــاری، سەرەڕای ئەوەی وەك مەتەڵ سوودی خۆیان هەیە، لە رووی زانستییەکانی ماتماتیك و بیرکاری و جەبریشدا بایەخێکی تایبەتیان هـــەیە، بەڵام تاکو ئێستا لەم رووەوە هەڵنەسەگێندراون، هـــەندێك مەتەڵی بیرکاری زۆر ئاسانن و تەنها وردبوونەوەیەکی کەمی دەوێت یا وەڵامی مەتەڵەکە هەر لە نێو دەقەکەدایە وەك:**

((**نیوەی هەزاری چوار سەد و بیست و پێنجە**)) **وەڵامەکەی:** 4× 125 = 500

**هەندێکیشیان وشیاری و قووڵبونەوەو لێکدانەوەی باشی دەوێ. هەروەها هەر چوار کرداری: (کۆ، کەم، جاران، دابەش) دەگرنەخۆ سەرەڕای توان وهاوکێشەی جەبری و ... نموونە بۆ توان:**

((**نۆ نوردی نان، نۆ نان نۆ نان، هەر نانەی نۆ کفتە لەسەر، هەر کفتەی نۆ پشیلە لەسەر، هەر پشیلەی نۆ فەرخە لەبەر، ئایا ژمارەی فەرخە پشیلەکان چەندە؟**)) = 9 **توان** 5 = 9×9×9×9×9= 59049 **بێچووە پشیلە.**

(9**نوردی،** 81**نان،** 729 **کفتە،** 6561**پشیلە ،** 59049**، بیچووە پشیلە**)

**هەندێك مەتەڵ وەك هاوکێشەیەکی جەبری داوای نرخی یەك بڕی نادیار دەکا وەك:**

((**رەوە چۆلەکەیەك بە ئاسماندا تێدەپەڕین، چۆلەکەیەکی تر لە سەر داریَ گوتی: ئێوە چەند چۆلەکەنە، یەکەکیان وەڵامی دایەوە و گوتی: ئێمە و هێندەی دیکەی ئێمە و نیوهەندەی ئێمە و چارەگی(چوار یەکی) ئێمە لەگەل تۆدا دەبینە سەد. ئایا چەند چۆلەکە بووین؟**)) **وەڵامەکەی :**

**هاوکێشە جەبرییەکەی :گریمان ژمارەی رەوە چۆلەکەکان یەکسانە بە (س) کەواتە:**

(س + س + 0.5س +0.25 س + 1 =100)

2.75س + 1 = 100

2.75س = 100 – 1

س = 99÷ 2.75

س = 36 ، 36+36+18+9+1=100.

هەندێکیشیان وەك هاوکێشەیەکی جەبری داوای نرخی دوو بڕی نادیار دەکەن وەك: ((دوو رەوە کۆتر لە تەنیشت یەکدی دەفڕین و لە یەکدیان دەپرسی ئەنگۆ چەند کۆترن، رەوەی یەکەم گوتی:. ئەگەر یەکێك لەنگۆ بێتە ناوەمە، ئەمە دەبینە هەندیئنگۆ. رەوەی دووەمیش گوتیان: ئەگەر یەکێك لەنگۆ وەگەر رەوەی مە بکەوی ئەوا ئەمە دەبینە دوو هەندی نگۆ. ئایا ژمارەی کۆتری هەر رەوەیەك چەند بووە؟))
وەڵام:-

گریمان ژمارەیکۆترەکانی رەوەی یەکەم = س .

ژمارەی کۆترەکانی رەوەی دووەمیش = ص.

کەواتە : س + 1= ص – 1

ص+1 =2(س –1)

س= 5، ص=7

1- 5+1 = 7 – 1

2- 7+1= 2(5–1).

## دەقی چەند مەتەڵێکی دیکەی تایبەت بە بیرکاری :

((رەوەکا تەیرا گۆتە رەوەکا تەیرێن دی :- ئەگەر یێك ژهنگۆ بێتە ناومە، ئەم دێ سێ جار هندی هنگۆ لێ هێین. رەوادی گۆتیێ:- نە خێرا ئەگەر یێك ژهنگۆ بێتە ناومە، ئەم دێ هندی ئێك لێ هێینۆ. ئایا ژمارا هەر رەوەکێ چەند بوویە؟)) (5 ، 3)

((بە پێبلقەکی چوومە سەر قەڵاتێ هەولێرێ، پایەکانم دەژماردن، دوو دووم دەژمارد یەك دەماوە، سێ سێم دەژمارد یەك دەماوە، چارچارم(چوار چوارم) دەژماردن یەك دەماوە، پێنج پێنجم دەژمارد یەك دەماوە، شەش شەشم دەژماردن هەر یەك دەماوە. ئایا پیبڵقەکە چەند پایەی هەیە؟)) وەڵام:- (121 ، 61)

((خراره گوێزێكمان هەیە, گوێزەكان دوو دوو دابنێی یەك دەمێنێتەوە، سێ سێیان دابنێی دوو دەمێننەوە، چوار چواریان دابنێی سێ دەمێننەوە، پێنج پێجیان دابنێی چوار دەمێنێتەوە، شەش شەشیان دابنێی پێنج دەمێننەوە، حەفت حەفتیان دابنێی شەش دەمێنێتەوە، هەشت هەشتیان دابنێی حەفت دەمێنێتەوە، نۆ نۆیان دابنێی هەشت دەمێنێتەوە ، دە دەیان دابنێی نۆ دەمێننەوە ، ئایا خرارەكە چەند گوێزی تێدایە؟)) (2519 گوێز)

((دوو پیرێژن یەكەو سەبەتەیەك هێلكەیان هەبوو، ئەگەر پیرەژنی یەكەم دوو هێلكە بداتە پیرەژنی دووەم ئەوا ژمارەی هێلكەكانیان یەكساندەبێت، ئەگەر پیرەژنی دووەم دوو هێلكە بداتە یەكەم ئەوا ژمارەی هێلكەی یەكەمیان دەبێتە دوو ئەوەندەی دووەمیان؟)) وەلام:- (14، 10)

((ژنە جوتیارێك هەندێك هێلكەی لە ناو سەبەتەیەكدا دەفرۆشت، پیاوێك نیوەی هێلكەكان و نیو هێلكەی لێكڕی، پیاوێكی دیكەش نیوەی هێلكە ماوەكان ونیو هێلكەی كڕی، سێیەم كەسیش نیوەی هێلكە ماوەكان و نیو هێلكەی كڕی، بەبێ ئەوەی هیچ هێلكەیەكیش بكەنە نیوە یا بیشكێنن، هەر كەسەو بەشی خۆی برد و رۆیشت، سەبەتەی هێلكەكانیش هیچ هێلكەیەكی تێدا نەمابوو، ئایا سەبەتەكە چەند هێلكەی تێدا بوو؟)) وەڵام: 7 هێلكە

(نیوەی 7 = 3.5 (+ 0.5)، نیوەی3= 1.5 (+ 0.5) ، نیوەی 1 = 0.5 (+0.5 )

((سێ كەس چوونە چێشتخانەیەك نانیان خوارد و ویستیان پارەكانیان بدەن، ئەوی یەكەم گوتی چەندت پول بدەمێ، خاوەن چێشتخانەكەش گوتی دەغیلەكەم چەندی تێدایە تۆش ئەوەندەی تێبكە وهەشت درهەم بۆ خۆت هەڵگرە، گوتیە دووەمیان دەخیلەكە چەندی تێدایە تۆش ئەوەندە بكە ناوی و هەشت درهەم بۆ خۆت هەڵگرەوە، گوتیە سێیەمیشیان دەخیلەكە چەندی تێدا ماوە تۆش ئەوەندەی بكە نـــاو و هەشت درهەمیش (پەنـــجایی) بۆخۆت هەڵگرەوە, دواجـــار كە سەیری

**دەخیلەکەی کرد بینی هیچی تێدا نەماوە، ئایا لە سەرەتادا دەخیلەکە چەند پەنجایی تێدابووە؟)) وەڵام: 7 پەنجایی** (7+7− 8=6)، (6+6−8=4) ، (4+4−8=0)، (4+4−8=0)

**((نەخۆشێکی شڕ داوای سێوی دەکرد، لە باغێکدا سێویان دەفرۆشت، بەڵام لە ڕێگەی باغەکەدا لەحەفت دەرگایان گومرگیان وەردەگرت، هەر دەرگەیەك بە جیا نیوەی سێوەکانیان وەك گومرگ لە کڕیارەکە دەستاند، دەبێت چەند سێو لە باغەوانەکە بکڕن بۆ ئەوەی سێوێك بگەیننە دەست نەخۆشەکە؟))** (128 **سێو**)

**((سێ برا، سی سەر مەڕیان هەبوو، مەڕەکان هەندێکیان یەك بەرخ و هەندێکیان دوو بەرخ و هەندێکیان سێ بەرخیان لەبەربوو، مەڕ و بەرخەکانیان بەشکردن و هەر یەکەیان دە مەڕو و بیست بەرخی بەرکەوت، بە مەرجێك هیچ بەرخێك لە دایکی دانەبڕا، ئایا چەند مەڕیان یەك بەرخ و چەندیان دوو بەرخ و چەندیان سێ بەرخیان هەبووە؟ ))** 3 × (3 **مەڕەی یەك بەرخی+** 4 **مەڕی دوو بەرخی** +3 **مەڕی سێ بەرخی**)

**((پیاوێك** 15 **سەر مەڕی هەبوو، کە مرد کوڕێك وکچێك و ژنێکی لە پاش بەجێمابوو، رایسپاردبوو: دەبێ نیوەی مەڕەکانی بدرێتە کوڕەکەی و چواریەکی بۆ کچەکەی بێت و پێنجیەکی بۆژنەکەی بێ، بەڵام دەبێ هەرکەسەیان بەبێ لە یەکتری کڕینەوە و بەبێ زیاد و کەم بەشی خۆیان وەربگرن ؟))**

(15+1 =16. : 8 **مەڕ بۆ کوڕەکە، +4 بۆ کچە، +** 3 **بەشی ژنەکە** =15)

**((کابرایەك مرد** 17 **سەر مەڕ و سێ کوڕی لە پاش بەجێمابوو، بە زیندوویی رایسپاردبوو کە نیوەی مەڕەکان بۆکوڕی گەورە و سێیەکی بۆ ناوەنجییەکەیان ونۆیەکی بۆ گچکەکەیان بێ، بەڵام بەمەرجێك هەر کەسەیان دەبێ بەشی خۆی بۆ جیابکرێتەوە و نابێ مەڕەکانیش بفرۆشن یا سەریان ببڕن یا بە نیوەیی بدەنە یەکتری. چۆنیان دابەش دەکەیت؟)) وەڵام:**

**(17+1 =18. : 9مەڕ بۆ کوڕی گەورە، + 6 بۆ ناوەنجییەکە، +2 بەشی گچکەکەیان =17)**

((چل کەس، پیاو و ژن و منداڵ تێکەڵاوبوون، چل سێویان بە سەردا دابەشکردن، هەرپیاوێك دوو سێویان دایێ و هەرژنێکیش سێو و نیوێك و هەرمنداڵێکیش نیو سێو، هەرکەسە و بەشی خۆی وەرگرت, ئایا چەندیان پیاو و چەندیان ژن و چەندیان منداڵبوون بۆ ئەوەی چل سێو بەسەر چل کەسدا دابەشبکرێت؟))

(2پیاو=4 سێو+17 ژن=25.5 سێو+21 منداڵ = 10.5.سێو)

((چل کەس، گڕوو( گەڕ) و کەچەڵ و کوێر، بەتێکەڵاوی چوونە گەرماو (حەمام) خۆیان شوشت، چـل دیناریان دایە خاوەن حەمامەکە، هەرگڕوێك دەبوو 4 دینار بدات و هەر کەچەڵێك 2 دینار و هەر کوێرێکیش چارەگە دینارێك, ئایا چەندیان گڕوو و چەندیان کەچەڵ و چەندیان کوێربوون، بۆ ئەوەی چل کەس بە چل دینار خۆیان بشۆن؟))(1 گڕو=4 دینار،15 کەچەڵ = 30 دینار، 24 کوێر= دینار، 40=40)

((سەد دینارت دەدەنێ، بۆ ئەوەی سەد سەر سپیان (مەڕو بەران و بەرخ)ی پێبکڕیت، بە مەرجێك هەر مەڕێك بە پێنج دینار و بەرانێك بە دینارێك و هەر بەرخێك بە درهەمێك بێت؟)) (19 مەڕ= 95 دینار، 1 بەران=1 دینار، 8بەرخ = 4 دینار، 100=100)

((سەد دینارت دەدەنێ ،بۆ ئەوەی سەد یەکسم (ئەسپ و هێستر و گوێدرێژ)ی پێبکڕیت، بە مەرجێك هەرئەسپێك بە 4 دینار و هێسترێك بە نیو دینار وهەرکەرێك بە چارێگە دینارێك بێت؟))

(15 ئەسپ= 60 دینار، 75 هێستر= 37.5 دینار، 10کەر= 2.5 دینار، 100=100)

((دوو برادەر هیزەیەکی پڕ دۆشاویان کڕی کە دە هۆقەی تێدابوو، بەڵام تەرازوویان لانەبوو بۆ ئەوی هەرکەسە و پێنج هۆقەکەی خۆی جودابکاتەوە، کابرای دۆشاوفرۆش دوودەفری دیکەی لەلابوو یەکێکیان حەفت هۆقە و ئەوی دیکەش سێ هۆقەی دەگرت، بۆی بەشکردن، چۆنی کردۆتە دو پێنج هۆقەیی ؟))(1 هۆقە = 4 کێلۆ

| دەفری سێ هۆقەیی | دەفری حەفت هۆقەیی | دەفری دە هۆقەیی |
| --- | --- | --- |
| 0 | 0 | 10 |
| 3 | 0 | 7 |
| 0 | 3 | 7 |
| 3 | 3 | 4 |
| 0 | 6 | 4 |
| 3 | 6 | 1 |
| 2 | 7 | 1 |
| 2 | 0 | 8 |
| 0 | 2 | 8 |
| 3 | 2 | 5 |
| 0 | 5 | 5 |

**((دوو کوڕ و دوو باوک سێ سێویان دانێ و هەر یەکەی سێوێکی بەرکەوت؟))**

**(کوڕ و باوک و باپیرن.)**

**((نۆ ڕەنووس (ژمارە)، لە یەکەوە تا نۆ بەبێ دووبارە کردنەوە، لە ناو نۆ چوارگۆشەی (3×3)دا بنووسە، بەمەرجێك سەرجەمی کۆی چوار گۆشەکانی تەك یەك بە ستوونی بکاتە پازدە و بە ئاسۆییش هەر بکاتە پازدە و بەشێوەی (×) هەر بکاتە پازدە؟))**

| | | | |
| --- | --- | --- | --- |
| 15 = | 4 | 9 | 2 |
| 15 = | 3 | 5 | 7 |
| 15 = | 8 | 1 | 6 |
| 15= | 15 = | 15 = | 15 = |

((ئاشەوان بە خۆی و بە ژنەوە، باراشهێڕ بە خۆی و بەخوشکەوە بوون سێ هەناریان دانێ و هەر یەکەی هەنارێکی بەرکەوت؟ ))

(ژنی ئاشەوان خوشکی باراشهێڕە)

((دە لە دەیان دەربێنی دەمێنێتەوە دە؟))

(دەستەوانە، دەسکێش، پەنجەوانە و پەنجەکانی هەردوو دەست)

((دە و دە ناکاتە بیست لەگەڵ پەنجای دەکاتە یازدە؟))          (کاتژمێر 10.10)

((لە پێنجان دوو بڕوا دەمێنێتەوە  یازدە؟))

(دوو رکات نوێژی بەیانی  لە پێنج نوێژ بڕوات دەمێنێتەو یازدە رکات)

((سێ کەس دوو سێویان خوارد، هەر یەکە و سێوێکی بەرکەوت؟))

(ژن و مێردیك بون، ژنەکە دووگیان بوو)

((دوو کەس بەندکران،دوای سێ مانگ کە  لە زیندان بەربوون، ببونە چوار؟))

(ژن و مێردێك بوون، ژنکە لە بەندیخانە جمکێکی ببوو)

((بە سێ گیانلەبەران، سێ سەر و شەش چاو و دوو لاقیان هەیە؟))

(ماسی+ مار + کەو)

**دەقی هەندێك مەتەڵ هەن لەگەڵ بەشەكانی ئێمە دیارمان كردوون رێك نەكەوتن، بۆیە ناچــاربووین لــە بەشێكی تایبەت و هەمەرەنگدا كۆیان بكەینەوە وەك:-**

**((مەلا ومەلاژن، قەشە و قەشەژن، مالم و مالمەژن دەیانەوێ لە زێیەك بپەڕنەوە، تەنها بەلەمێكی بێ بەلەمەوان هەیە كە ئەویش تەنها دوو كەس هەڵدەگرێت، مەلا و قەشە و مالم، هەرسێكیان دڵیان لە یەكدی پیسە و هەر یەك لەوان ناهێڵێت ژنەكەی لەگەڵ خۆی نەبێت لەگەڵ هیچ پیاوێكی دیكە سواری بەلەمەكە بێت. چۆنیان دەپەڕێنیتەوە؟))**

**(هەرسێ ژنەكە بە دوو كاروانان دەپەڕنەوە، ماڵمەژن دەگەڕێتەوە و بەلەمەكە دێنێتەوە، مالم و مالمەژن دەمێننەوە، مەلا و قەشە پێكەوە سواردەبن و دەپەڕنەوە لای ژنەكانیان. مەلا و مەلاژن سواری بەلەمەكە دەبنەوە و دەگەڕێنەوە، مەلا و مالم ژنەكانیان جێ دێلن و پێكەوە دەپەڕنەوە، قەشەژن بە دوو كاروانان هەدووژنەكەی دیكە دەپەڕێنێتەوە)**

**((پیاوێك، مەڕێك و گــورگێك و گونییە جــۆیەكی هــەبوو، دەیویست لە رووباری بیانپەڕێنێتەوە، لە كەناری زێیەكشدا بەلەمێكی بێ بەلەمەوان هەبوو كە ئەویش تەنها خودی كابراكە و یەكێك لە سێ شتەكانی هەڵدەگرت، ئەگەر گورگەكە بێی خاوەنەكەی لەوبەر یا لەمبەر بكەوێتە لای مــەڕەكە ئەوا دەیخــوات، خــۆ ئەگەر مەڕەكەش بكەوێتە لای جۆیەكە هەمدیسان جۆیەكەی دەخورێت، ناچاریشە دەبێ یەك یەك بیانپەڕێنیتەوە. چۆنیان دەپەڕێنیتەوە؟))**

**(گورگ و جۆیەكە جێدێلێ و مەڕەكە دەپەڕێنیتەوە، دەگەڕێتەوە و گورگەكەش دەپەڕێنێتەوە،مەڕەكە لەگەڵ خۆیدا دەگێڕێتەوە، مەڕەكە جێدێلێت و جۆیەكە دەپەڕێنێتەوە و لای گورگەكە و دای دەنێت، دواجار دەگەڕێتەوە و مەڕەكە دوبارە دەپەڕێنێتەوە)**

((سی کەس لە ناو بەلەمێکدا بوون و لە ناو دەریادا دەڕۆیشتن، بەلەمەکە بەر شتێك کەوت و کون بوو، دەبوو پازدە کەس فرێبدەن بۆ ئەوەی باری بەلەمەکەیان سـووکبێت و پازدەکەی دیکە بتوانن بگەنە شـوێنی مەبەست، سەرنشینەکان 15 مـوسڵمان و 15 بتپەرست بـوون، لەنێوان خۆیاندا وا رێککەوتن بە تێکەڵاوی لە تەك یەك بەڕیز بوەستن و هەرجارەی هەشت کەس بژمێرن و نۆیەم باوێنە ناو دەریاکەوە، بە جورێك ڕیزبوون کە لە ئەنجامدا هەر پازدە بتپەرستەکان فرێدرانە ناو دەریا و هەموو موسڵمانەکانیش گەیشتنە شوێنی مەبەست ئایا چۆن ریزببوون؟))

ئەم مەتەڵە بە فۆلکلۆر نازانم؟؟ × موسڵمان ، + بتپەرست

+ × × + + × + + + × × + + × + × × × + × × + + + + +× × × ×

((سیٚ کەس بەسەر پردێکدا پەڕینەوە، یەکەمیان پردەکەی بە چاو دیت و بەسەر پـردەکە دارۆیشت و پێی بەر پـردەکە کەوت و پەڕییەوە، دووەمیان پردەکەی دیت بەڵام پێی بەرنەکەوت و پەڕییەوە، سێیەمیان نە پردەکەی دیت نە پێی بەر پردەکە کەوت کەچیپەڕییوەش؟)) (ژنێك منداڵێکی لە ئامێزە و یەکێکیشی لە سکی دایە)

((لە کچێکیان پرسی :- دایکت بۆ کویٚ چووە؟ ئەویش گوتی:- چووە دۆستی بکاتە دوژمن، یەکی بکاتە دوو، دێتەوە دووان دەکاتە یەك؟))

(چووبوو داوای قەرز بکاتەوە، مامانی ژنێك دەکا کە منداڵی دەبوو، بێتەوەش لێفێکی دووبەرگ بدرووی)

((باوکێك و دایکێك و کوڕێك، چایان لەپێش بوو، پیاوەکە چایەکەی لە راستەوە بەرەو چەپ بە ملاك تێك ئەدا، ژنەکە لە چەپەوە بۆ راست، منداڵەکەش بە شیوەی بازنە تێکی ئەدا . بۆ چایەکانیان وا تێك ئەدا؟)) (بۆ ئەوەی شەکرەکە بتوێتەوە)

((پیاوێك لە دەرەوەی وڵات گەرایەوە، ژنەکەی پێی گوت:. پیاوەکە چیت بە دیاری بۆ هێناوم، ئەویش گوتی:. هەگبەکەم بکەوە شتێکی وەك خۆت جوانم بۆ هێناوی. کوڕەکەی گووتی:. باوکە چیت بۆ من بە دیاری هێناوە؟ ئەویش گوتی:. هەگبەکەم

بکـــەوە شتێکی وەك خــــۆت شیرینم بــۆ هێناوی. کچە بچکۆلەکەشی گوتی:. بــاوکە ئەی بــۆ مـــن چیت هێناوە؟ باوك:. هەگبەکەم بکەنەوە شتێکی وەك خۆت ناسك و نازدارم بۆ هێناوی. ئایا چی بۆ هێنابوون؟))                    (ئاوێنەیەك)

((هەم خەسووە و هەم بووکە؟))     (ژنێك خەسووی ماوە و کوڕەکەشی ژنی هێناوە)

((ژورێك پڕی کچ بوو، هەر پیاوێك بچووبووایەتە ژوورەوە  کچەکان دەیانکوشت. بەڵام پیاوێك چووە ژوورە و گوتی من نـــــۆ قسان دەکەم ئەوجا بمکوژن، کە قسەکانی کرد کچەکان نەیان کوشت و هاتە دەرەوە. ئایا پیاوەکە چی گوتووە  بۆ ئەوەی کچەکان نەیکوژن؟)) (گوتبووی :کامە کچ لە هەمووتان پیرترە یان  ناشیرینـترە با ئەو بمکوژێت!)

((پیاوێکی ســـەر رووتاوە بۆ چـــارەسەری قــژ وەرین چـــووە لای دکـــتۆر، دکتۆریش سەیری کرد و دەرمانێکی بۆ نووسی و گوتی لە دەرمانخانەکەی ژێرەوەمان دەرمـــانەکە بکـــڕە، کابراکەش چـــووە دەرمـــانحانەکە و چـــاوی بە خـــاوەنی دەرمانخانەکە کەوت, دەرمانەکەی نەکڕی و کاغەزی دکتۆری دڕاند و چووە دەرەوە. بۆ دەرمانەکەی نەکڕی؟)) (چونکە خاوەن دەرمانخانەکەش سەری رووتابۆوە– ئەگەر کەچەڵ دکتۆر با  چارەی سەری خۆی دەکرد)

((پاشایەك ویستی راوێژکارێکی بکوژێت، وەزیرەکانی لە دیوانیٚ کۆکردنەوە و گوتی: دوو کاغەزم نووسیون و خستوومنەتە نێو قووتیەك، لە  یەکێکبان نووسراوە (لە سەری بدە)، لەوی دیکەش نووسراوە (ئازادی بکە)، با بەخۆی بێت یەکێکیان رابکێشێت، کامەیانی دەرهێنا ئەوی لەگەڵ جیٚبەجیٚدەکەم، راوێژکارەکەش دوو سیٚ قسەی کردن و کاغەزێکیانی راکێشا و پاشا نەیتوانی بیکوژێت،دەبیٚ چی گوتبێت؟)) (گوتبووی :  ئەگەر نووسرابوو ((ئازادی بکە)) ئەوا تۆ بمکوژە، ئەگەریش نووسرابوو ((لە سەری بدە)) ئەوا ئازادم بکە ..چونکە دەیزانی لە هەردوو کاغەزەکە نووسراوە لە سەری بدە.)

((خاڵ بۆ ئەم پیتانەی خوارەوە دابنیٚ، بەمەرجێك مانایەكی تەواو ببەخشیٚ!))

ـــە سەر ـــە سەرـــە سەردەكا. (بەشەر، بەشەربە، شەڕ دەكا)

((نیوەی لە هەوە, نیوەشی لێرە؟)) (هەولێر)

((ئەوە چییە لە تەیراوەی دەست پیٚدەكا، لە قەلاٚت كۆتایی دیٚ؟)) (پیتی ت)

((ئەوە چییە لە ئاسمان دیارە ، لە زەوی دیار نییە؟)) (پیتی س)

((ئەوە چییە لە قەڕنێك جارێك دەبیندریٚ، لە ساڵێك نابیندریٚ، لە دەقیقەیەك دوو جار دەبیندریٚ ؟)) (پیتی ق)

((ل مام هەیە، ل خال تونە، ل ماڵ هەیە، ل باڵ توونە؟)) (پیتی م )

((لە نێوان زەوی و ئاسماندا چی هەیە؟)) (پیتی و)

((ناوی شارێكە،باری دوو ولاٚخە؟)) (چوارتا)

((ناوی خواردنێكە، لە هەر لاوە بیخۆی وەك یەكە؟)) (نان، خۆخ)

((ناوی خواردنێكە، پێچەوانەی بكەیتەوە دەبێتە ناوی ولاٚتێكی عەرەبی؟)) (ماش، شام)

((مەتەڵێكم هەیەپێنج پیتە، لە ئارد دایە و بیٚپیتە، پاش و پێشی وەك یەكە، ئەوی مەتەڵەی هەڵبێنی، دیارە هونەر ئەنوێنی؟)) (كەپەك)

((پیاوێك بە یەك سعات چووە حەج و گەڕایەوەش؟))

(سعاتەكەی دەستی خۆی نەگۆڕیبوو)

((لە پەنجەرە دەچێتە ژوورەوە و لە دەرگا دێتە دەرەوە؟)) (نامە و سندوقی پۆستە)

**هەندێك مەتەڵ سووكی منداڵانە : .**

((بە شانت، بە شەرواڵت، زاوای خاڵت، هاتە ماڵت، چی دەدەیتێ ؟))

(باوكت هاتە ماڵت چی دەدەیتێ)

((تاكە خوشكی خارتە (خاڵتە) و پلكیشت (پووریشت) نیە؟)) (دایكتە)

((كوڕی باوكتە و كوڕی دایكتە و براشت نییە؟)) (خۆتی)

((مێردی بووكی نەنكت، هاتە ماڵت ،چیئەدەیتێ)) (باوكت بێتەوە چی ئەدەیتێ)

((نانە خۆرەی پێنج ئەنگوست چییە؟)) (مرۆ)

((بەچ دەڵێن ژاژی و بە چی دەڵێن كفتە؟)) (بە دەمی)

((چوومە ماڵێك ژن و مێردێك دانیشتبوون، پێیان پێكەنیم، بەچی پێكەنیم؟))

(بەدەم و لێوم)

((چۆن دە كەس لە ژێر چەترێكی ئاسایی دەوەستن و تەڕیش نابن ؟))

(لە رۆژێكدا كە باران نەبێت)

((چۆن دەستت دەخەیتە ناو پیاڵەێك چای و دەستیشت تەڕنابێت؟)) (چای وشك )

**تێبینی:**

**هەندێك گەمە لە كۆڕی مەتەڵ گوتندا دەكرێن و بیركردنەوەی باشیشی دەوێت، وەك: یاری هێلكاری و شێوە دروستكردن.**

**دانان و هەڵگرتنەوەی دەنكە (داركە) شخاتە. دانان و هەڵگرتنەوەی بەرد كەتا رادەیەك لە دامەكردن دەكات ...**

**بەڵام چونكە بە دەست دەكرێن و پتریش بە لای یاری دادەشكێنەوە بۆیە لەگەڵ مەتەڵ تۆمارمان نەكردن .**

ئەم جۆرە مەتەڵانە باسی شتێکی تایبەتی دەکەن، بەڵام لە نێو دەقی مەتەڵەکەدا راستەوخۆ و بێپێچ وپەنا وەڵامەکە دەڵێت، تەنها هەست راگرتن و وردبوونەوەیەکی کەمی گەرەکە، لە هەمان کاتیشدا جۆرە شێواندن و بە هەڵەبردنێك لە گوتنی مەتەڵەکە دەکەن، وەك بڵێی پیت و وشەکان لە گۆکردندا تێکەڵاو دەکەن و بە خێرایی دەگوترێن بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی تەفرەبدات و بۆ شتێکی دیکە هەڵەتەی بکات، ئەو جۆرە مەتەڵانە تایبەتن بە منداڵ و مرۆڤی ساویلکە و تامگێل نموونە: .

((ئەگەر ئەقڵت بێ ئەقڵ بەهەشتە، شەش پەل و دوو شاخ، پەپوولەی دەشتە))

(پەپوولە)

((ئەورەشە مووشە)) (ئەو رەشە مووە)

((بەرەلەبەنە.)) (بەرە لە بەن دروستدەکرێ)

((بێتەرتاڵە، لێوتەرەدوونە.)) (رووەکی (بی) تامی تاڵە و دوو لێوی مرۆڤیش تەرن)

((بێکلکە و بێتووکە، گیاندار شرو ور ، بۆرە وەك مار، چوارپێیە وەك سوار، بۆقیشەو پێت ناڵێم.)) (بۆق)

((بیکەرەمتاشی)) (بیکەرە ئەم تایەشیان)

((بێ لاق و بێ بارە( باڵە)، لە راکردن بەغارە، هێلکە دەکا مارە)) (مار)

((پرتانە، پرتانە، هەرچی نەزانی حەیوانە)) (پرتان، تانۆك، پەرژین،چەپەر)

((پێ چو ماشین)) (پێ رۆیشت، شوێنەکەی مایەوە)

((پیرەژنێ گمە گمە، تێمهەڵدەن سەرەسمە، پیسکە ئەویش جاجمە)) (جاجم)

((پیرەژنێloورە لوورە، لێدەن بە بەردە زوورە، پیسکە ئەویش مافوورە)) (مافوور)

((تەنها سێ هێلکەیان بە سەر حەفسەد و دوو پیاوان دا بەشکرد، هەموویان یەك و هێلکەیان بەرکەوت.)) (حەفسەد ناوی کچێکە)

((جۆگەی دەکات.)) (کە رووەکی جۆ گەشەدەکات قەف و گە دەکات)

((جۆماکاچوو.)) (جۆ ماوە،کا (با) بردی)

((چنار قیت  و گامێش بەسەرەوەیە.))  (دارچنار بەرزە و گامێشیش سەری هەیە)

((چوار پێی قوتەکە (قوندەکە) لە بانان رادەکا، بۆقە و پێت ناڵێم.))

((چواری چەقە، دووی زەقە، بۆقیشە و پێت ناڵێم.))                    (بۆق)

((حەلوای تەنکە نانی هەتا نەیخۆی نازانی؟))

((خانە خوێیەك خزمەتێکی باشی میوانەکەی کرد، بەڵام کە بەڕێی کرد پێی گوت خوات لەگەڵ نەبی، میوانەکەش گوتیماڵت ئاوانەبی، بۆ وایان گوت؟))

(هەردووکیان ناویان نەبی(کانەبی) بوو)

((خڕە وەك گۆیە، ترشە وەك دۆیە، کەرە لیمۆیە.))                    (لیمۆ)

((خڕە و قووڵە و مدەوەر، کڵاویشە و پێت ناڵێم.))                    (کڵاو)

((خودا نەی کردووە و هەیە.))                    (نەی، قامیش)

((خودا نەی ناوە هەس.))                    (نەی، قامیش)

((خۆشەمووشە))                    (خۆ ئیمڕۆ شەممەیە)

((خوشکەکەتان ژنی کامتانە))                    (کەتان ناوی ژنێکە)

((خوێیسوور داسووك خوار.))          (تامی خوێ سوێرە و داسی درەویش خوارە)

((دایکی حەمەدی ئامینێ ناوی چییە؟))          (ئامین ناوی دایکی حەمەدییە)

((دارەبەن دەشاخی دایە و کەریش بەسەرەوەیە.))

(داربنێشت لە شاخە و کەریش سەری هەیە)

((دەبزانە، بزبزە هەرزانە، یەك (هەسان)ە و یەك (گویزان)ە؟))

((دەچییە کنی کــفرە، دەستی بۆ دەبەی هەر کــفرە، ناوی دێنی هەر کـــفرە، سەیری دەکەی هەر کـفر کفرە))                    (دەوەنی کفر)

((دەری دارە و ناوی قوڕە، کەرە فامکە خشتبڕە.))                    (خشتبڕ)

((دەسکی دارە ، سەری بزمارە، سپیە و درێژە، کەرە درێشە.))                    (درێشە)

((درێژە تەنگە، کورتە تەنگە، خڕە تەنگە.))                    (تەنگەی کورتانی وڵاخ)

((دووی دەزەقن، دووی دەڕەقن، دووی دەلەقن، چار دەچەقن، ئەگەر

نازانی شێتۆکەی خۆمان ، بزن بزن.)) (چاو و شاخ و گوێ و قاچی بزن)

((دۆینەی بە زستانێ لێ دەنێن، بە بەهارێ دەیخۆن))

(ئێوارەی نەورۆز لێی دەنێن و رۆژی دواتر دەیخۆن)

((رەشە لووسەزل.)) (ئەو رەشە لووسە تاڵە مووە)

((سەر خڕی ناو بۆش.)) (مەتەڵێکی نوێیە، پیاوێك بۆشی ناوە)

((سەر خڕی ناو شیرین.)) (شیرین ناوی کچێکی کەللە خڕە)

((سەری تەسکە و بنی بلاوە، گێژە کلاوە ، بێژە کلاوە.)) (کلاو)

((سەری تیژە بنی کونە، گێژە بزانە سوژنە.)) (سوژن)

((سەری راستە و کلکی خوارە، نیوەی ئاسنە و نیوەی دارە، هێرە مشارە، کەرۆ مشارە.)) (مشار)

((سەری قەوی بنی باریك، کەرە توورە، کەرە توورە!) (توور)

((سپییە لووسە زل)) (ئەو سپییە لووسە زلە کایە)

((سپیە و درێژە چۆڕاوە، ئەگەر نازانی پلاوە.)) (پلاو برنج)

((سێ پل پانە تەنگە، تەنگە، تەنگە.)) (تەنگەی کورتانی ولاخ)

((سێ پێنج پازدە، دوو حەڤدە، سێ بیست.))( 3 × 5 (=15) + 2 (=17)+3 = 20)

((سێتۆن کا؟)) ، ((سێ لۆریکا) ( سی تەن کا)

((شێست و دوو کەر لە ملەکی چوونە دەر، بوونە شەش گوە و سێ سەر.

(شێست ناوی پیاوێکە)

((شیوێك بە بەهارێ لێندرا، بە پایزێیان خوارد، هێشتا هەر گەرم بوو.))

(بەهار و پایز دووناوی کچانەن)

((قەڵ فڕی گۆزە بە قوونەوە.)) (قەڵ دەفڕێت و گۆزەش ژێری هەیە)

((کاچوو مادانی.)) (با هات، کای برد، ما دان)

((کانۆکانە نۆ کانۆکانە، کەرۆ بزانە، کوڕۆ بزانە.)) (کای نۆك)

((کە دەچتە جۆتی یەکە، دێتەوە سێنە)) (سێنە، ناوی جوتیارەکەیە)

((کەڵەبابی پیرە پلکێ، بەیانیان کلك لە سەر قونێ، ئێواران  قون لەبن کلکێ.))
(کلك لەسەر قونێیە و ،قونیش لەبن کلکێیە)

((کلکی باریك خۆی ئەستوورە، کەرە تەندوورە.)) (تەندوور)

((گایەکم دیت پیست و دوو شاخی هەبوو)) (گا پیستەیەك و دوو قۆچی هەیە)

((گۆشتی سەگی گڕوو دەخورێ)) (پێست و گۆشتی سەگی گەڕ خورشتی هەیە)

((گوێت هەرەو دوونە)) (گوێت هەر ئەو دووانەن)

((گوێ لەسەرە.)) (گوێ بە سەرەوە نووساوە)

((لاس و ژن ، مانای چیە؟)) (پیاوێکی ناو لاس و ژنەکەی)

((لەسەرێ چنارێ کانییە.)) (کا لە سەر دار چنارا نییە)

((لە لای ئێوە کە یەکێك بمرێت چرا لەسەر کنگیا دائەنێن.))
(چرا لەسەر ژێری خۆیا دائەنرێت)

((لەو تایەش کەن، دەو تایەش کەن.)) (تای تەرازوو یا گونییە)

((مەڕی مەمی، مەم شوان، نۆ مەڕ، دە بێری، یازدە کسۆك، دوازدە بەران، هەموو چەندن؟)) ( 9 مەڕ +1 بێری + 1 کسۆك(سەگ) + ا بەران =12)

((مۆزتەڕەلیچە)) (مۆز تەڕە و لینچە)

((مەلا بە رۆژووە و پیزاودەخواتەوە، رۆژووەکەشی ناشکێ.)) (پیاز ئاو دەخواتەوە)

((مەلاێك ختمێکی قورئانی بە یەك سعات خوێند!))
(مەبەست کات نییە، سعاتەکەی لەبری خوێندنەکە وەرگرتووە)

((من باوکی خۆم لەناو لانکدا بینیوە)) (من لە ناو بێشکە بووم باوکی خۆم دیوە)

((ناومالّێ بە شەکرەی رادێخن.)) (شەکرە ناوی ئافرەتێکە)

((نیوەی هەزاری چوار سەد و بیست و پێنجە.)) ( 4 × 125 =500)

((هەندووکە، بە دندووکە، ناوی نۆکە.)) (نۆك)

((یەکێکم دیت سی و دوو چاوی هەبو.)) (مرۆ سیپەلاك و دوو چاوی هەیە)

ئەم جـــۆرەیان مـەتەڵ و هەڵهێنان نین، بەڵام تـــاقیکـــردنەوە و ڕەوانبێژی و تێکەوتنی تێدایە و لە کۆڕی مەتەڵ گوتندا دەگوترێن:

هەندێ جار بە دووبـارەکردنەوەی ڕستەکان یا وشەکان یا پیتەکان کە بەزۆری لە یەکدی نزیکن وجێگەی پیت یا وشەکان دەگۆڕێن، مانایەکی سەیر دێتە کایەوە و کابراکە تێدەکەوێت، هەندێك لەم گوتانە چەند پیتێکن کە بە خێرایی چەند جارێك دەیانڵێنەوە جنێو بەخۆیان دەدەن و درەنگیش هەست بە جنێودانی خۆیان دەکەن، ئەوانەی کە زمانیان ڕەوان نییە یا زوو هەست بە داوەکە ناکەن تێدەکەون یا تێکەڵاویان دەکەن...بەشی زۆری ئەم جۆرە ڕستانە بۆ پێکەنینی منداڵان داندراون بەڵام لە هەمان کاتیشدا زیرەکی و ڕەوانی ئەو کەسانە دەردەخات کە دەیانڵێنەوە.

نموونە:

**پێنج جار خێرا خێرا و لەسەر یەك ئەم گوتانەی خوارەوە دوبارە بکەوە:**

**سەڵم کی . ... ، شەکەرم جا....، رم هیٚ....،**

**گم سە ....، گیٚ لە سەرم.....، لکم گۆ. ....هتد**

**حەوت جار خێرا خێرا و لەسەر یەك ئەم ڕستانەی خوارەوە دوبارە بکەوە: .**

((ئەو ڕەشماڵە شەش تەختە ڕەشماڵە، تەڕ شەش تەختە ڕەشماڵە.))

((بەرخی بەحریٚ))

((بلە خڕە، زۆر جل شڕ و دڕە))

((پیرەژنەی گو زەردە، گوو زەردەم بە دەمت، دەمت بە گوو زەردەم.))

((تەرمی نحیٚ، بابی نحیٚ ، نح لەپشتیٚ، هەرچی حەفت جاران بیڵیٚ دەچتە بەهەشتیٚ))

((جەنجەڕی حەمە خەنجەری جیڕەجیڕیەتی.))

((چل چەنگ تۆچەڵتووك، چووە کن چل چەنگ تۆ چەڵتوکی، گۆتی ئەتۆ چ چل چەنگ تۆ چەڵتووکی؟ گوتی ئەمن چل چەنگ تۆ چەڵتووکم، ئەدی ئەتۆ چ چل چەنگ تۆ چەڵتووکی؟.))

((چومە چەمی چەقان، چەقەڵ چەڵتوکی ئەتەقاند.))

((چومە سەر کێلی قەبری قەمەرەلوڕ، پاڵمدا بە کێلی قەبری قەمەرەلوڕ، ئافەرین قەمەرەلوڕ بۆ خۆت و کێلی قەبرت قەمەرەلوڕ.))

((چوومە ماڵێ رەشەی رەشمیشاغەی، گۆتمە ژنێ رەشەی رەشمیشاغەی، بمدێ رێشمە رەشی ئەسپە رەشی رەشمیشاغەی.))

((چومە چۆمەکی چار سنگم بڕین بە جارەکی، دووم کوتا کایێ، دووم دا دایێ.))

((چوومە چۆمەکی بە نیسك، لێی بوو نێریەکی بە تیسك، تیسکم گرت و هەریهاتمێ( هەڵیهاتمێ) تیسکم بەردا و هەریهاتمێ.))

((چوومە دۆڵەکی بە پووش، تێیدابوو ئەسپێکی توش، ئەمن وەشاندم ئەسپ تووشاندی.))

((چوومە سەر کانییەکی سێ کۆتك تێ، یەك گوو تێ، یەك توو تێ، یەك موو تێ. یا توو تێدا هەر تووم خوارد، یا موو تێدا هەر تووم خوارد، یا گوو تێدا هەر تووم خوارد.))

((چوومە چۆمەکی تەڕ، لێی بوو دوو گای لەڕ ، یەك شلە لەڕ، یەك قوڵە لەڕ ، ئەوان دەیانخوارد شلەهەڕ، ئەمن دەمخوارد شنگی تەڕ.))

((خوری ئەم بەڕە تەڕە، لە خوری کام مەڕە لەڕ بڕاوەتەوە.))

((رەخ و چانێت چێلێ و چالێ، زقڕیم کەفتمە چالێ))

((ریویەکی رەقی رنیاوە، لە لێوی لێڕ و لێەڕەوارەکی، ریوی لۆ لێڕی دەلووری، لێڕ لۆ ریوی دەلووری.))

((ریوی لەڕە، جلی تەڕە، لە گەوەڕا، تەڕ لەوەڕا.))

((سەد دەرزی دوو سەد دەرزی، بە کونی دەرزی دایکم دابەزی.))

((سرکە سۆرەی بە تاتی، غارم دایێ بە ساتی، سرکەم خوارد سل بەجێما.))

((سیٚ سەبەت بە ئاویٚ داهاتن، یەك گوو، یەك موو، یەك توو، لە گوی بەزم ، لە مووی بەزم، تووی دەگەزم. لەقەم دا لە گوو، چنگم دا لە موو، قەپم دا لە توو.))

((شاخ و گر و گندۆر، تێڕ سپیی یا کوژی سۆر. یخ کەر، یخ جل. یخ جڵهوڕ))

(شەش تەشت مزاش، مشت مزاش.))

((شەش مریشکم هەنە، سێی سپی پۆپیتە رەش، سێی رەشی پۆپیتە سپی.))

((شەش شویشەن سەر شەش سەرشۆرکا شویشتن.))

((شلە ساوار سیٚ شلە ساوار.))

((شوانی مەڕە لەڕ لەوەڕێن ئەو مەڕە لەڕە لە رۆخی ریێٚ و لە لێڕی مەلەوەڕێنە.))

((قالە قیتە، قەیتانی قاچی قرتاند.))

(( قەت قەڵ لە کەڵی قەشقەی کەوی نابی.))

((قەڵا کەو قڕکرن.))

((قەڵە رەشەی سەر گومەتی، هورد هورد کلکی دەکوتی، پلم بە پتت، پتت بە پلم.))

((قەڵەباچکەی سەر مێوی ، جار جار کلکی دەبزێوی، خشپ کلکم بە قنگی، خشپ قنگی بە کلکم.))

((قوڕی کۆڕیٚ کەری قڕ کرد.))

((قولی کوڕەك هەبوو، کوڕیٚ قولی کەوەك هەبوو، چ کەو ژ کەویٚ کوڕی قولی خورتتر نەبو.))

((کاوە لە کارگەی کۆکاکۆلای کەرکوك کرێکارە))

((کەلە کۆتکی ئاشی سوسیٚ، بە شەوی سێشەم دەسووتیٚ.))

((کوژییٚ تێڕکا دایێٚ سۆر و زەرە.))

((کوونا مامیٚ من قیڕ پیێڤە، قیڕ ب کوونا مامیٚ من ڤە.))

((گاکەی کاکەم، کاکەی گاکەی خوارد.))

((گەیشتمە نێرییەکی پرچن پرچن، هەر پرچم گرت و هەڵیهاتمیٚ ، هەر پرچم بەردا و هەڵیهاتمیٚ.))

((گەیشتمە تاژیەکی ریخن ریخن، هەر ریخم برد لە بۆ دەمی و هەر دەمی هێنا لە بۆ ریخیٚ.))

((گۆشتی شەکی سوورم خوارد.))

((مام وسو بە شەوی سێشەم مەچووە شووە بییان، لۆ سەوەشیر و سەوییان))

((مەشکە رەشەی دەرك بەشە، دەرکت بە دەستی دایکم، دەستی دایکم بە دەرکت))

((میوانەکمان هات، دایکم نۆ نانی دایێ، نۆ گای دایێ. نۆ نانی دایێ، نۆ گای دایێ ، نۆ نانی دایێ نۆ گای دایێ.))

((مام رەپەدان چوومە تەڕکان، تەڕکی منی بە بنی تەڕکی، بنی تەڕکی ویم بە تەڕکی.))

((هەرلێرە هەتا منارە، هەمووی کون و کوند و کۆلارە ، کونی کوندەی دایکم یارە.))

**((و قبرُ حربٍ بمكانٍ قفرٍ... وليس قربَ قبر حرب قبرُ))**

**((لنا بقرةٌ، ولبقرتنا رقبةٌ، ولرقبة بقرتنا رقةُ، ورقة رقبة بقرتنا أرق من رقة رقبة بقرتكم))**

**((ركب أمه، شال أبوه، شرب ميت ببطن حي، أكل حلال ببطن حرام... ؟))**

**((خالي رجل أمي... ؟))** خاڵۆم پیاوێکی نەخوێندەوارە

## چەند پرسیارێك

هەموومان دەزانین کە مـــەتەڵی فۆلــکلۆری پــــــــــرسیارن و لە کۆنەوە هەڵبەسـتراون، لـە کۆتـایی پرسـیارە کۆنەکانـدا بـەباشمان زانـی چـەند پرسـیارێکی سەردەمی بڵاوبوونەوەی زانست و خــــــوێندەواری و کۆمپیوتەر وئەتنەرنێت و ... رووبـەروی خـۆم و خوێنــەران بکەمـەوە، بـۆ ئـەوەی رابـردوو و ئێـستا و داهـاتوو بەیەکەوە ببەستینەوە، بەڵام ئەوەی لە ماوەی حەفتەیەکا وەڵامیان نەداتەو ئەوا !!!!. مەبەستمان لە پــــــرسیارەکان قــووڵبوونەوە و بــــیرکردنەوەیە، بۆ ئەوەی چاومان بکەینەوە و پتر بەدوای زانیاریدا بگەڕێین و رۆشــــــنبیری گشتی و هەمەبابەتمان زۆرتر بکەین. پرسیارەکان :

1- لە خولەکێکدا چەند جار مرۆڤێکی ئاسایی: دڵی لێدەدات؟ چەندجار هەناسە دەدات؟ چەندجار چاودەتروکێنی؟ هەروەها بۆ ماوەی چەند دەتوانێت بژی بەبێ :- هەناسەدان ؟بەبێ خۆراك خواردن؟ بەبێخواردنەوەی ئاو و شلەمەنی؟ بەبێ نووستن ؟

2- ناوی سێ ترسناکترین نەخۆشی ئەم سەردەمە بژمێرە؟

3- کێشی گـۆی زەمبن چـەندە؟ تیرەکـەی چـەندە؟ رووبـەری وشـکاییەکەی چـەندە؟ چەند لە مانگەوە دوورە؟ چەندیش لە خۆرەوە دوورە؟ ناوی سێ بەرزترین لووتکە چیای جیهان بژمێرە؟ قووڵترین خاڵ لە زەریاکاندا لەسەر ئاستی دەریاوە لە کوێیە و چەند قووڵە؟ نـاوی سـێ درێـژترین رووبـار لـە جیهانـدا؟ سـێ بـەرزترین تاڤگـە لـە جیهانـدا؟ سـێ درێـژترین پـرد لـە جیهانـدا؟ سـێبەرزترین کۆشـك لەجیهانـدا ؟سـێ گەورەترین مزگەوت لە جیهاندا بژمێرە؟ ناوی حەوت شتە سەیروسەمەرەکانی جیهان بژمێرە؟

4- لەسـاڵی 1900ز دانیـشتوانی سـەرگۆی زەوی چـەندبوون؟ ئێـستا چـەندن ؟ لـە 2050 دەبنەچەند؟ چەند وڵاتی سەربەخۆ لە جیهاندا هەن؟ ناوی سێ گەورەترین و ناوی سێ بچووکترین وڵاتانی جیهان لە رووبەردا؟ و دواتریش لە دانیشتواندا؟ ئینجا

**لەرووی ئابوورییەوە بژمێرە؟ سێ کۆنترین شار لەجیهاندا، سێ گەورەترین شار لە دانیشتوان لە جیهاندا بژمێرە؟ گەورەترین نەتەوەی بێوڵاتی سەربەخۆ کامەیە؟**

**5- سێ بەناوبانگترین وڵاتانی جیهان لە بەرهەمهێنانی :- نەوت ؟ زێڕ؟ گەنم؟ برنج؟ مانگا؟ مەڕ؟ ماسی بژمێرە؟**

**6- خێراترین گیانلەبەر لەراکردندا ناوی چییە و چەند کیلۆمەترە لە کاتژمێرێکدا ؟ گەورەترین گیانلەبەر لەوشکایی دواتریش لە ئاودا ناویان چییە و کێشیان چەندە؟- ناوی خێراترین باڵندە لە فڕیندا؟ لە راکردنا ؟ ناوی چاوتیژترین گیانلەبەر؟ ناوەی بەبۆنترین(هەستی بۆنکردن) گیانلەبەر بێنە؟**

**7- خێرایی تیشك چەندە ؟ خێرایی دەنگ چەندە؟ خێرایی خێراترین فڕۆکە؟ خێراترین ئوتومبێل؟ خێراترین شەمەنەفەر چەند کم/کاتژمێرە؟**

**8- کێ و کەی کارەبای دۆزییەوە ؟ کێ و کەی و لە کوێ شەمەندنەفەری دروستکرد؟ کێ و کەی و لە کوێ ترومبێلی دروستکرد؟ کێ و کەی و لە کوێ رادیۆی دروستکرد؟ کێ و کەی و لە کوێ تەلەفزیۆنی دروستکرد؟ کێ و کەی و لە کوێ فڕۆکەی دروستکرد ؟ کێ و کەی و لە کوێ کۆمپیوتەری دروستکرد ؟**

**9- یەکەم نووسین لەجیهاندا کەی بووە و لە کوێ بووە؟ یەکەم نووسین بە زمانی کوردی کامەیە و کەی و لە کوێ بووە ؟ یەکەم رۆژنامە لەجیهاندا کەی و لە کوێ دەرچووە؟ یەکەم رۆژنامەی کوردی کەی و لە کوێ و کێ دەریکردووە؟**

**10- پێناسەی ئەم ناوانەی خوارەوە بکە:**

**شێخ عوبێدوڵڵای نەهری، عومەر کوڕی عەبدول عەزیز، غەزالی، ئیبنول سینا، مایکل ئەنگلۆ، بتهۆڤن، گۆتە، فرۆید، داروین، مەندل، ئەنشتاین، ئەبراهام لنکۆلن...**

# سەرچاوەکان

1 ئاوازی ئەحمەدی حەمەدەمین دزەیی (1984) فۆلکلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا، بەغدا ، ل94-96.
2 احمد عبدالله زەرۆ (985) مامکێن کوردی ، بەغدا.
3 احمد عبدالله زەرۆ (982) نووسەری کورد، ژ8،خولی دوو ، ... مامکێن کوردی، 7-27 .
4 ئەحمەد قەرەنی (984) کانی ، بەغدا، ل 136-150.
5 ئۆرخانی غالب (1982) گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ 94، ل 78-79.
6 ئۆرخانی غالب (1984) چەند باسێکی ئەدەبی، سلێمانی ، ل 25-36.
7 بەیان ، گۆڤار ، ژ 13 (974) (گرەوی ژمارە)، ل بەرگی دواوە لە ناوەوەرا.
8 بڕەك ئەیوبیان ( 1982) هەتەڵەی کوردی – ئێران-مهاباد.
9 پیرەمێرد- کاکەی فەلاح (1982 ) پەندەکانی پیرەمێرد ، ب 1 ، چ 2 ، ل 107 .
10 پیرەمێردی نەمر – کاکەی فەلاح (1980) پەندەکانی پیرەمێرد ، ب 4 , ل 142-143.
11 پێزانی ئالیخانی ( 985) دوو مراری ژ گەنجینا فۆلکلۆرێ کوردی، هەولێر ، ل 7-56 .
12 حەسەن جاف (1985) چیرۆکی نوێی کوردی، ل 55 ، بەغدا، چاپخانەی عەلا.
13 جمال بابان (1971) پەروەردە و زانست، بۆ زاخاوی مێشك، ژ 1، ساڵی 1، ل96.
14 جەلال مەحمود عەلی (1982) ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا،ل 284،279،237، 292، 295.
15 خالد حسین(985) دەرگەهەك بۆ فۆلکلۆری کوردی، بەغدا، ل 87-88.
16 رەحیمی قازی د. (1359) پێش مەرگە، چ 2، ل پێنجەم و شەشەم.
16 رۆستەم باجەلان (983) گۆڤاری کاروان، ژ 14 ، ل 111-112 .
17 رۆستەم باجەلان (985) فۆلکلۆر : کۆمەڵە بەرهەمێکی فۆلکلۆرییە، ب 2، بەغدا، ل 28-45.
18 رۆستەم باجەلان (986) گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، بەغدا، ژ 109، ل333- 342.
19 سەدرەدین خۆشناو ( 986) گۆڤاری کاروان،ژ 48 ، ل 104-115.
20 سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر (998) گۆڤاری کاروان ژ 119 ،ل 121.116 .
21 سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر (998) گۆڤاری کاروان ژ 126، ل 117.113.
22 سەردار فەتاح (1977) خەرمانێك لە مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی، چاپخانەی راپەڕین.
23 سروە، گۆڤار ، ئێران- ورمێ، چاپخانەی سەلاحەدینی ئەیوبی، ژمارەکانی: 21، 22، 23، 24، 25، 26، و ژمارە 53 ساڵی 1369 ، هەشت مەتەڵ. ژمارە 54 ، دوازدە مەتەڵ و ژمارە 59، حەڤدە مەتەڵ و. ژمارە 60 ، نۆ مەتەڵی تێدایە.......،..

24 سعدالله اسماعیل شێخانی ( 1985) گوڵبژێرێك له فۆلكلۆری كوردیدا، بەغدا ،ل 64-84
25 شوكریه د. رەسول ئیبراهیم ( 1983) گۆڤاری كاروان ، لێكۆلینەوەی زانستی فۆلكلۆر... ژ 14 ، ل 16-25.
26 شوكریه د. رەسول ئیبراهیم ( 1984) پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی كوردی، زانكۆی سەلاحەدین، بەغدا، چاپخانەی الادیب.
27 شوكریه د. رەسول ( 1984) ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی ، ب 2، زانكۆی سەلاحەدین.
28 شكریه رەسوولْ ئیبراهیم ( 1997) رێگاكانی كاری مەیدانی فۆلكلۆری كوردی ، هەولێر.
29 شوكر مستەفا (1987) گۆڤاری بەیان ، ژ 135، ل 99.سی مامكی كوردستانی سوریای تێدایە.
30 عەباس عەبدوڵا یوسف (984) فۆلكلۆر : كۆمەڵە بەرهەمێكی فۆلكلۆرییە –بەشی یەكەم، بەغدا، ل 31-32.
31 عەباس عەبدوڵا یوسف (985) فۆلكلۆر : بەشی دووەم بەغدا، ل 46-50.
32 عەباس عەبدوڵا یوسف (985) فۆلكلۆر : بەشی سێیەم ، بەغدا، ل 55- 61.
33 عەباس عەبدوڵا یوسف (1991) فۆلكلۆر : بەشی دووەم، بەغدا، ل 46-50.
34 عەزیز گەردی ( 1972) رەوانبێژی، بەرگی یەكەم ، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا.
35 عەزیز گەردی ( 1979 ) رەوانبێژی، بەرگی سێیەم – سلێمانی ، ل 52، 68،64، 72.
36 عەزیز گەردی ( 1974) رەخنەی ئەدەبی، چاپخانەی الحوادث ، بەغدا.
37 عومەر د. ئیبراهیم عەزیز (1985) فۆلكلۆر، بەشی دووەم, بەغدا، ل 3-19.
38 د. عومەر ئیبراهیم عەزیز(1992) گۆڤاری لاوك، ژ 1، ساڵی 1، بیبلۆگرافیای فۆلكلۆری كوردی ، ل 98 .
39 عومەر شێخەڵلا دەشتەكی، پەندی كوردی، ب 1 (1972) و ب 2 (1980)، ل 127و 143
40 علاءالدین سجادی (978) دەقەكانی ئەدەبی كوردی، بەغدا، ل 163-167.
41 د.عیزەدین مستەفا رەسوول (1979) لێكۆلینەوەی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، چ- 2 ل 210- 213، زانكۆی سلێمانی . چاپی یەكەمیش لە ساڵی 1970 بووە.
42 فخرالدین رۆوف نقشبندی (بابە شیخ) ( 1978) چەپكێك لە مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی. سلێمانی، چاپخانەی كامەران.
43 كامەران موكری (984) ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، زانكۆی سەلاحەدین، ل 102-105.
44 كەریم شارەزا ( 1983) پەندی بەراوردكاری ، بەغدا، چاپخانەی سەمیرامیس.

45 لاوك ،(1980) ، ملوانكەی مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی، گۆڤاری ئاسۆی زانكۆ ،ژ 2، ساڵی چوارەم، ل 83–89.

46 كوردۆیف ، قەناتی كوردۆ ( 976) كۆمەڵە تێكستی فۆلكلۆری كوردی، شوكر مستەفا، بەغد، ل 268– 273 .

47 محمد كریم شەریف (1971) فۆلكلۆری هۆنراوەكانی كوردەواری ، بەغدا. چ 2، ل 12–18

48 محمد كریم شەریف ( 971 ) فۆلكلۆری یارییەكانی كوردەواری، كەركوك، ل 178–180.

49 محمدی مەلا كریم (981) گۆڤاری رۆژی كوردستان، ژ 63(یان 60[1]) ، ل 34–42.

50 نەقابەی مامۆستایان، هەولێر (1961) سەرنجێك لە دەروازەی فۆلكلۆری كوردەوە، ژ 1، ل 25. بەغدا ، چاپخانەی ارشاد.

51 وەزارەتی پەروەردە (1979) زمان و ئەدەبی كوردی، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی.

52 هۆشیار نوری لەك (2004) مەتەڵی كوردەواری، هەولێر.

53 هێمن موكریانی (975) تحفة مظفرية، ئۆسكارمان، ب 1، كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا.

54 د.هیوا عمر احمد (1979) ، مێژووی فۆلكلۆر ، گۆڤاری نووسەری كورد ، ژ 4، ل 66

55 د.هیوا عمر احمد (985) ، ئەدەبی فۆلكلۆری منداڵان ، رۆژی كوردستان ، ژ 69، ل 36

56 الكساندر هجرتي كراب ( 1967) علم الفولكلور ، ترجمە رشدی صالح، القاهرە.

57 جوزيف فاخوري ( ) حك دماغك ، هل انت ذكي– المكتبة الحديثة، بيروت، ص 15 و 24.

58 دار ابن النديم ( ) الحوازير الشعبية، مبناها ومعناها– 222حزورة، بغداد،ص 23– 42.

59 رجاء ناجي الدبو (1985) الألغاز متعة وفائدة، بغداد، ص 8 و 9.

60 عبدالاله رؤوف ( 985) كتاب الألغاز (( اختبر ذكائك ))، بغداد، ص 14 و 24.

61 د. عبدالمجيد يونس (1973) دفاعا عن الفولكلور.

62 محمد توفيق وردي (1975) نماذج التراث الشعبي الكردي، نجف، ص 61–68.

63 محمد عابد الجابري (1985) نحن والتراث، الطبعة الرابعة، بيروت، دار التنوير.

64 ئەنتەرنێت ویب: (rinkworks. Com/brainfood) Riddles. com


---

1– لە بەرگی گۆڤارەكە نووسراوە ژمارە 63، كەچی لە پێرستی ناوەرۆكی بەشە كوردییەكەی نووسراوە ژمارە 60 .!

## سوپاس و پێزانین

ئەم بەڕێزانەی لە خوارەوە ناویان نووسراوە زۆر بە دڵسۆزییەوە یارمەتیان داوم، هیوای تەمەندرێژیان بۆ دەخوازم و ئاواتمە وێنەیان زۆربێت.

- پ. د. شوکریە رەسووڵ:- چاوی بە لێکۆڵینەوە و پۆلینکردنەکاندا خشاندووە و پێشەکی بۆ نووسیوە.
- بەڕێز د. عەزیز گەردی : بەسەر کتێبەکدا چۆتەوە.
- بەڕێز مامۆستا عەبدولکەریم مەحمود شێخانی: بەسەر کتێبەکدا چۆتەوە.

ئەو بەڕێزانەی بە وێنەی فۆلکلۆری یارمەتیان داوم :-
- هونەرمەند حوسێن عەبدوڵا خۆشناو لە چالاکی قەتابخانەکان-هەولێر.
- شێخ جەعفەر بەرزنجی لە بەڕیوەبەرایەتی فۆلکلۆر- وەزارەتی رۆشنبیری- هەولێر
- چەند وێنەیەکیشم لە گۆڤارەکانی: بەیان، کاروان، نوسەری کورد، گزنگ...(عگا قزاز، سلیمان شاکر عارف، جەمال بەختیار) ورگرتووە.
- عوسمان پیرداود(نووسینگەی گۆڤار): بەرگ و وێنەکانی ئامادەکردووە.

سوپاس و پێزانیشم بۆ ئەو دڵسۆزانەی کە لە کۆکردنەوەی مەتەڵەکاندا یارمەتیان داوم: ـ

1-دایکم (هەمین ئەحمەد مەلا عەبدولرەحمان،60ساڵ )دەشتی هەولێر .نەخوێندەوار
2- مامۆستایان (عەبدولباقی فارس،45 ساڵ) و (مامۆستا ئەسکەندەر مزووری) لە دەڤەری مزوری و بارزان و ئۆردوگاکانی قوشتەپە وهەریر .
3- خاتوو( زاریّ ، هاوسەری مەلا خدر قادر، 51 ساڵ) ، نەخوێندەوار، لە کەندێناوە و دوبز..
4- خاتوو( زێنەب خێزانی مەلا ئەحمەد خەنجەر گەوری قوڵتەپەیی، 70ساڵ ) نەخوێندەوار، لە ناوچەی دەشتی هەولێر.
5- مام (عەزەکوردە ،72 ساڵ و عەیشێی کچی40، ساڵ)، نەخوێندەوار، سەرگەڕان،دیبەگە

6- مامۆستا (ئیحسان محەمەد عەلی، 46 ساڵ ) لە ناوچەی ڕێدار و ساڵەیی و کەرکوک.

7-مامۆستا ( سەباح ئەسعەد خۆشناو، 48 ساڵ )، لە ناوچەی خۆشناوەتی.

8-مامۆستا (فاتیح حاجی مەحمەد دارەبەنی، 45 ساڵ) لە ناوچەی گەردیایەتی .

9-مامۆستا( ئومێد سالح عەولاّ، 28 ساڵ ) لە هەریر و خۆشناوەتی و سورچیایەتی.

11-مامۆستا (سەتار عەباس ڕەزا مەسیح) قوتابی لە کۆلێجی پەروەردە، زمانی کوردی، زانکۆی بەغدا- لە گەڵ کۆمەڵە قوتابییەکی هاوڕێی .لە دەڤەرە جیاجیاکانی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی

12- مامۆستا (حەمەدەمینی حاجی محەمەدی مەمی خەلی، 46 ساڵ) فەرمانبەری دارستان، لە ناوچەی چۆمان و باڵەکایەتی و ڕواندز.

13-مامۆستا( تایەری مەلا ئەنوەر گۆمەگڕوویی، 52 ساڵ) لە تەقتەق و ئۆمەر گومەت.

14- مامۆستایان (وەلی....؟؟و شەوچرا درویّش...) لە ناوچەی سلێمانی و هەورامان.

15-مامۆستایان: (محەمەد سالح، 48 ساڵ) ڕابەری کشتوکاڵ و (حەسەن سەربەنی) لە دەڤەری دهۆك.

16-ئەندازیارانی کشتوکاڵ (کەژاڵ محیّدین کابایز، 28 ساڵ). مەتەڵەکانیشی پاکنووس کردەوە و چەند مەتەڵی شاری هەولێریشی لە لابوو. (هاژە عوسمان دزەیی)

17- مامۆستا (صخریا عیسا کەریم هەرمۆتەیی،42 ساڵ) لە کۆیە، هەندێك مەتەڵی بۆ هێنام کە پێشتر بە زمانی سریانی و عەرەبی لە گۆڤاری (بیت النهرین)بڵاوکرابوونەوە.

18- مامۆستا ( فەخرییە فەتحولاّ عەلی، 58 ساڵ) هەولێر.

19- مامۆستا (عەبدوالغەفار سابیر خورشید، 36 ساڵ، هەولێر)،مەتەڵی ئینگلیزی بۆ هێنام

20- مامۆستا ( وریا قاتع ،64 ساڵ)، لە هەورامان و پێنجوین و مەریوان و مەتەڵی فارسی.

21- مامۆستا ( حەکیمی مەلا سالح)، لە هەڵەبجە و مەتەڵی فارسی.

22- مامۆستایان (سەید تەلعەت خەفاف ، 62 ساڵ، هەولێر ) و (احسان صابر سعید، 58 ساڵ، هەولێر) مەتەڵی تورکییان بۆ هێنام .

23- مامۆستا عومەری مەولودی ، 55 ساڵ، بۆکان



## نووسەر لە چەند دێڕێکدا:

- سەدرەدین نورەدین مەلا ئەبوبەکر شێخبزێنی .
- لە 1951/9/1 لە گوندی هەمزەکۆر/ قوشتەپە/ هەولێر -هەرێمی کوردستانی عێراق لەدایك بووە.
- لە ســاڵی 1973 پەیمانگـــەی کشتوکاڵی/ پاراستنی ڕووەك لە بەغدا بە پلەی یەکەم تەواو کردووە .
- لە ساڵی 1990 کۆلیژی کشتوکاڵی لە زانکۆی بەغدا بە پلەی یەکەمەکانی کۆلیژ تەواو کردووە .
- تاکو ئێستا (29) کتێب و نامیلکەی بە چاپ گەیاندووە، وێڕای گەلێك وتار و لێکۆڵینەوە کە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی هەرێمی کوردستان بڵاوکراونەتەوە.

کتێبە بەناوبانگەکانی :

1- (هەنگ بەخێوکردن) بە کــوردی و بە عـــارەبی- 2001 و 2004 .
2- (دەرد و نەخۆشییەکانی ڕووەك) بە کوردی و بە عارەبی) - 2003 .
3- (شەخەڵی دار بەڕوو- سنووری ستەم و ئازار ) ڕۆمان - 2004 .

- لە بواری کەلەپوری کوردیشدا :

(زەمبیل فرۆش) و (لاس و خــەزال)- لێکۆڵینەوە و پەخشـــانی چیرۆك، کە لەلایەن بـــەڕێز (سەعدوڵا شێخانی) کۆکرابۆوە و لە ساڵی 1986 چاپکراوە .